هەیە، بە هۆی سروشتەكانیان چاك نییە، بە ئاشكرا لەبەردەم خەڵكی گشتی گفتوگۆ و دانووستانیان لەسەر بكەین.

سیاسەتی ئێمە بەیادی خۆت بهێنیەوە، لەبەر ئەوە واپێویست دەكات، ئەو حاڵەتانەی بۆ هاوڵاتیان باسی دەكەین، پێویستە لێیان تێنەگەن، بەڵام پێویستە هەندێك لە بڕیارە سیاسەكانمان بڵاوبكەینەوە، بەبێ ئەوەی روونیان بكەینەوە. بڕیارەكانی تایبەتن بە نوێكردنەوەی پرنسیپەكانی ماف، دەبینن وەكو بڕیارەكانی بڵاویان دەكەینەوە كاردەن، كە گرنگی شاردەنەوەیان لە هەقیقەتەكەیاندا تەواو دەبێت، چونكە ئەو پرنسیپەی بە ئاشكرا نایخەینە روو، دەرفەتمان پێدەدات بە ئازادی كاربكەین بۆ گەیشتن بە مەبەستەكانمان، چونكە پرنسیپێكی لەو شێوەیە، ئەگەر یەكجار رابگەیەندرێت، وەكو ئەوەیە بڕیاری لەسەر درابێت، هاوكات هەركاتێك پرنسیپەكان دەبن بە بڕیار دەرفەتی ئازادی كاركردنمان بۆ نامێنێتەوە.

٢- گەلەكەمان رێزێكی تایەتی هەیە، لەبەر ئەوەی هێزێكی بلیمەتی سیاسی دەپارێزێت، دەستە باڵاكەی هەموو كارێك دەكات، گەلەكەمان بەو شێوەیە بە زیندوویی دەمێنێتەوە(ئای لە بێهیوایی قێزەون)، بەڵام (ئایی لەو كەسەی بە كارامەیی و لێهاتوویی پرنسیپەكان جێبەجێ دەكات!) - (ئای لەو كەسەی فێڵی هەیە)- (ئای لەو كەسەی پرنسیپەكان بە تێگەیشتن و بوێری جێبەجێدەكات!).

٣- ئێمە پشتدەبەستین بە ڕاکێشانی سەرنجی هەموو نەتەوەکان، بۆ کارکردن لەسەر بەهێزکردنی ئەو ململانێیە نوێیەی کە خۆمان نەخشەمان بۆ کێشاوە و دامانناوە، لەبەر ئەوە پێویستە دەستمان بە خزمەتی نوێنەرە سەرکێش و ئازاکانمان بگات، کە لەتواناباندایە بەسەر ئەو ئاستەنگ و گرفتانەی دێتە سەر ڕێگای پێشکەوتنمان سەرکەون.

٤- ئەو کاتەی کودەتای سیاسیی(Coup detat) ئەنجام دەدەین، بە خەڵك دەڵێین: هەموو شتێك زۆر بەخراپی بەڕێوچووە، هەمووتان ئازارتان چێژتووە، ئێستا ئێمە هۆکاری ئازارەکانتان دەسڕینەوە، هەروەها بە "نەتەوییەکان و کۆمکارە نەتەوەییەکان" دەڵێین: بە دڵنیایی ئێوە لە تۆمەتبارکردنەکانی ئێمە ئازادن، بەڵام ئایە دەتوانن فەرمانڕەوایی پاك و بێخەوشی خۆتان بکەن، کەپێشتر فەرمانڕەواییتان کردووە، ئێستا ئێوە ئەزموونی فەرمانڕەواییکردنتان هەیە، ئایە دەتوانن لەپێناوی چاکەی خۆتان کار بکە؟ ئەو کاتە لەسەر شانی خۆیان بە سەرکەوتوویی و هیوا و خۆشحاڵییەوە بەرزمان دەکەنەوە، هەروەها هێزی دەنگدانی ئەو تاکە بێکەڵکانەی لە ڕەگەزی مرۆڤن، لە ڕێگای کۆبوونەوەی ڕێکخراو و ڕێککەوتنی پێشوەختە ڕامانهێناون، ئەو کاتە ڕۆڵی کۆتایی خۆیان دەگێڕن، ئەو هێزەی خۆمان لێیان نزیکردووەتەوە بۆ ئەوەی بە دەستی خۆیان"بمانخەنە سەر عەرش"، ئەو هێزە لە کۆتاییدا قەرزەکەمان دەداتەوە، ئەو هێزە خۆشحاڵە، چونکە دەیەوێت

ئەنجامی پرسەکەمان ببینێت، پێش ئەوەی بڕیاری خۆی بدات، واتە پێش ئەوەی خۆی فەرمانڕەوایی خۆی بکات، دەیەوێت ئێمە فەرمانڕەوای بین.

٥- بۆ ئەوەی لە کاتی دەنگدان زۆرینەی رەها بەدەستبهێنین، پێویستە بەبێ جیاوازی چینایەتی هەموو تاکێك رازیبکەن دەنگ بە ئێمە بدات، بەڵام لەناو چینی خوێندەواران زۆرینەی دەنگەکان بەدەست ناهێنین، هەروەها لەو کۆمەڵگەیانەی دابەشبوونە بەسەر توێژی جیاواز.

ئەگەر ئایدیایەك گرنگی خودی بۆ تاك هەبێت، بیخەینە نێو ئەقڵیی هەموو تاکێك، بەو ئایدیایە ژیانی خێزانی نەتەوەییەکانی دیکەی ناجور هەڵدەوەشێنینەوە و لەناودەبەین[1]، هاوکات گرنگی پەروەردەی خێزان خراپ دەکەین، هەروەها ئەو پیاوانەی زانا و ژیرن و بیرمەند لە گەیشتن بە پێشەنگی پەکدەخەین، هەڵبەتە خەڵکی گشتی لەژێر رێنمای ئێمەدان، رێگرن لەسەر دواخستنە ژیر و بیرمەند و ئاقڵەکان، بەو شێوەیە خەڵکی

---

[1]- جووەکان لەدوای کودەتای کۆمۆنیستە بەلشەفییەکان بە کردار هەوڵیاندەدا سیستەمی خێزان هەڵبوەشێنەوە و لەناوییبەن، چونکە سیستەمی خێزان بەهێزترین ئاستەنگ بوو لەدژی سیستەمەکەمان، لە هەموو شوێنێك بە پراکتیکی دژایەتی سیستەمی خێزانیان دەکرد، بۆ نموونە (دورکهایم) بیرمەند و کۆمەڵناسی فەرەنسی لە زانستی کۆمەڵناسی بە روونی دانووستان لەسەر هەوڵی کۆمۆنیستە بەلشەفییەکانی روسیا دەکات، کە چۆن کار بۆ هەڵوەشانەی سیستەمی خێزانی دەکەن.

گشتی بە ئەبەدی ڕێگا بە زانا و ژیرەکان نادەن، بڕیار لەسەر هیچ پلانێك بدەن[1].

ئەو هاولاتیانەی پارەیان پێدەدەین لە بەرانبەر گوێڕایەڵیان و جێبەجێکردنی فرمانەکانمانە، بە گشتی ڕاهاتوون خۆیان لەپێناوی ئێمەدا بەخت بکەن، بەو ئامرازە هێزێکی کوێر بە ئاستێك دروستدەکەین، کە ئەبەدی حکومەتە نەتەوەییەکان ناتوانان هیچ بڕیارێك بەبێ ڕێنمایی نوێنەرانی ئێمە دەربکەن، ئەو نوێنەرانەی لەناو دەزگاکاندا جێگیرمان کردوون بە مەبەستی سەرکرایەتیکردنی حکومەتەکان.

٦- هاولاتیان ملکەچی ئەو دەستەلاتە(System) نوێیە دەبن، لەبەر ئەوەی دەزانن ئەو سەرکردانەی ئێمە سەرچاوەی کرێ و موچە و قازانج و هەموو سودێکی دیکەی ئەوانن، پێویستە سیستەمی حکومەت بە یەك

---

[1] - ئەو پلانەی جووەکان دایانڕشتبوو، ئەمڕۆ زۆر بە سەرکەوتوویی جێبەجێ بووە، خەڵك بەهۆی نزمی ئاستی تێگەشتنیان ناتوانن بە چاکی پێشبینی باردۆخەکان بکەن، لەبەر ئەوەی ئاستی مەعریفی خەڵك بە گشتی لاوازە، بەهۆی نزمی ئاستی پەروەردە و گرنگینەدان بە خەڵکی بیرمەند و ژیر لە کۆمەڵگەکانی جیهان بەگشتی، خەڵکی نەزان بەوەی دەیڵێت و دەیزانێت تەنها ژاوەژاوە و جیاوازی لە نێوان چاکە و خراپە ناکات، بەو شێوەیە هەر دۆخێك یان حالەتێك لە دەوروبەری ڕوویدات، ئەگەر هەڵە بێت یان درۆ لێی تێناگات، بەڵکو ئەوەی گرنگە لە ئارەزووەکانی نزیك بێت، ئەوە بەبێ دوو دڵی پێی ڕازییە.

ئەقڵ کار بکات، ئەگەر کارەکانی هاوبەش بێت لە نێوان چەند ئەقڵێک، ئەکردەییە بتوانێت سەرکەوتوو بێت، لەبەر ئەو هۆکارە فەرمانڕەوا گوێمان لێناگرێت، تەنها بەزانینی پلانی کار نەبێت، بەڵام پێویستە بەهیچ رێکارێك گفتووگۆی لەگەڵ نەکەین، تاکو کاریگەرییە خراپەکانی تێکنەدەین، هەروەها ئەرکی بەشە جیاوازەکانی پەك نەخەین، واتای نییە هەموو ئەندامێکمان، لەسەر نموونەی ئەو پلانانە گفتووگۆ بکات، ئەو ئەندامە دەگۆڕین ملکەچی پێداچوونە نابێت، کەواتە تێکەڵ بووە بە ئەنجامی هەموو هەڵەتێکەشتنێکی ئەقڵیی، ئەو هەڵە تێکەیشتنانەی لە ئەنجامی وێناکردنی ئەقڵی خودی هاتووەتە ئاراوە، چونکە ئەزموونی ئەودیوی واتا ئەزموونی پشتی ڕووداوەکانی نەکردووە، لەبەر ئەوە پێویستە کۆتا پلانمان لۆژیکی و پوخت بێت، پێویستە لەسەرمان کاری مەزن و گەورە بە سەرکردەکەمان نەسپێرین، بۆ ئەوەی بەشەکانی حکومەتەکە لەسەر دەستی هاوڵاتیان لەت لەت نەکات، هەروەها لەسەر دەستی کۆمەڵەی تیرەی(Glique) لەت لەت نەکات.

٧- ئەمڕۆ ئەو پلانەی ئێمە، دەستور و دەزگا بونیادنراوەکان ئاوەژوو ناکاتەوە، بەڵکو تیۆرە ئابوورییەکان بەپێی پلان دەگۆڕێت، لە دوایدا هەموو رێگاکانی پێشکەوتن دەگۆڕێت، ئەو کاتەی رێگاکان دەگۆڕێن، بێگومان پێویستە ئەو رێگایە بگرینەبەر کە پلانەکەمان دەیسەپێنێت.

٨- لە هەموو وڵاتێك هەمان ئەو دەستە و رێکخراوانە دادەمەزرێنین، بەڵام لەژێر ناوی جیاواز، وەکو: "ئەنجوومەنی نوێنەرانی گەل، وەزارات،

ئەنجوومەنی پیران، ئەنجوومەنی عەرش بە هەموو جۆرەکانی، کۆنسەی سەرۆکایەتی، ئەنجوومەنی دەستەی یاسادانان و کارگێڕی". پێویست ناکات پێکهاتەی میکانیکی بەیەکەوە بەستنەوەی نێوان ئەو دەستە جیاوازانەتان بۆ روون بکەمەوە، چونکە پرسی بەیەکەوە بەستنەوەیان پێش ئێستا لەلای ئێوە بە جووانی ناسراوە، تێبینی ئەوە بکەن هەموو دەستەیەك لەو دەستانە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردووە، گونجاوە لەگەڵ ئەرکێکی گرنگ لە حکومەتدا (من وشەی گرنگ بۆ ئاماژەکردن بە ئەرکەکان بەکاردەهێنم، نەك بۆ ئاماژەکردن بە دەستەکان).

هەڵبەتە ئەو دەستانە بەخودی خۆیان هەموو ئەرکە حکومیەکانیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کردووە، ئەرکەکانی حکومەت بریتن لە: "دەستەڵاتی دادەوەری، دەستەڵاتی یاسادانان، دەستەڵاتی جێبەجێکردن"، ئەرکەکانیان هاوشێوە و چوونیەکە لەگەڵ ئەرکی ئەندامە جیاوازەکانی جەستەی مرۆڤ.

٩- کاتێك ئێمە ئازاری بە هەموو کەسەکانی ناو دەزگا حکومیەکان دەدەین ، ئەوە هەموو دەزگاکانی دەوڵەت وەکو جەستەی مرۆڤ نەخۆش دەکەون، لە دوایدا دەوڵەت بەو نەخۆشیە دەمرێت، کاتێك دەرزی ژەهری (ئازادی) لە سیستەمی دەوڵەت دەدەین، تەندروستی سیاسی دەگۆڕێت، ئەوە دەوڵەت توشی میکرۆبی مردن (Infected) دەبێت، نەخۆشییەکە نەخۆشی شیبوونەوەی خوێنە( Decomposation

of the blood)، بەو شێوەیە دەوڵەت هیچ توانایەکی نامێنێت و دەکەوێتە پەلەقاژێی مەرگ.

١٠- حکومەتە دەستوورییەکان لە منداڵدانی ئازادیخوازان لەدایکبوون، کە شوێنی حکومەتە ئەرستۆکراسیەکانیان گرتەوە، تەنها حکومەتی ئەرستۆکراتی بۆ نەتەوەییەکانی ناجوور فۆرمی حکومەتی سودەبەخش بوو، وەکو دەزانن حکومەتە دەستوورییەکان لە قوتابخانەیەك بۆ ئاژاوە و ناکۆکی و ڕووبەڕوو بوونەوە و هەیەجانی حیزبی بێئەنجام زیاتر نییە، بە کورتی و پوختی حکومەتی دەستوری قوتابخانەی هەموو شتێکی بێ بنەما و بێواتایە، بەردەوام پێگەی حکومەت کەمدەکاتەوە، گوتاری میدیاکان، بۆ نموونە ڕۆژنامەکان وادەکەن پاشاکان تەمبەڵ و بێکەڵك و بێدەستەڵات بن، بەو شێوەیە پاشا بێ دەستکەوتە و زیادەیە و خەڵك پێویستی پێی نییە، لەبەر ئەو هۆکارە لە زۆربەی وڵاتان پاشا بەراوێزخراوە، بە واتایەکی دیکە پاشای حکومەتە دەستوورییەکان ڕۆڵیان لەناو حکومەتدا نەماوە، چونکە هیچیان لەدەست نایەت، بۆیە تەنها بارگرانین لەسەر خەڵکی نەتەوەییەکانی. ئێمە دەتوانین لە داهاتوویەکی نزیکدا سیستەمی کۆماری دابمەزرێنین، لەسایەی سیستەمی کۆماری نوێ لە شوێنی پاشا دڵسۆزەکان پێکەنینمان[1] دانا، کەسایەتی

---

[1] - کەسێك خەڵك بە قسە و رەفتارەکانی پێدەکەنێت، کەسایەتی سەرۆك بێشکۆیە و هەزەلی و پێکەنیناویە، وەك و ئەو کەسی خەڵك بە هەموو قسە و رەفتارەکانی پێدەکەنێت، کاتێك دەردەکەوێت لە دیدی خەڵك وێنایەکی

سەرۆکی دانراو پێکەنیناویە، سەرۆکمان لە کەسانی بەربەری و بێکەڵکی نێو حەشیمەت و کۆیلەکانمان هەڵبژاردووە، بەوشێوەیە ئەو مینەمان لەژێر نەتەوەییەکانی نا جوو جێگیر کردووە، بەواتایەکی دیکە لەژێر گەلە نەتەوەییەکانمان داناوە.

١١- لە داهاتوویەکی نزیکدا وادەکەین سەرۆك بەرپرس بێت[1].

١٢- ئەو کاتە دۆشدانامێنین کە دەمانەوێت پلانەکەمان بە بوێری جێبەجێبکەین، چونکە سەرۆکە بوکەڵەکەمان (Dummy) بەرپرسی حکومەتە، ئەگەر پێویستمان پێبوو، ئەوە خوێندکارانی گونجاوی لاواز لە روویی ئەکادیمی رێکدەخەین، بەو خوێندکارانە پەشێوی و ئاژاوە دەخولقێنین، بە مەبەستی دانانی سەرۆکێکی هەقیقی؟ ئایە ئەو پەشێویانە کۆتایی لەناوچوونی وڵاتەکە دەرەخسێنێت؟

---

کاریکاتێری هەیە. نموونەی ئەم جۆرە سەرۆکانە لە جیهانی ئێستادا زۆرن، بەڵام تەنها کەسانی رۆشنبیر و تێگەیشتوو دەیانبینن، بۆ نموونە (قەزافی، سەرۆکەکانی کەنداو، سەرۆکەکانی هەندێك لە وڵاتانی خۆرئاوا،....).

[1]- ئەگەر بە روونی تێبینی بکەین، لە جیهانی ئەمڕۆدا بە روونی دەبینین زۆربەی سەرۆکەکان کەسانی نەشیاون بۆ پێگەی سەرۆکایەتی کردنی گەلان، بە تایبەتی لە وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، چونکە ئەوەی گرنگی پێنادەن بەرژەوەندییەکانی گەلە، هاوکات لەبەرانبەر هەموو نەهامەتی و رووداوێکی بەسەر گەل دادێت، تەنها پێدەکەنن.

١٣- بۆئەوەی بگەینە ئەو ئەنجامەی گەرەکمانە، هەڵبژادن بۆ کەسانێك لە نموونەی ئەو سەرۆکانە بەڕێوەدەبەین، ئەو سەرۆکانەی لاپەڕەکانی ژیانی پێشویان بە گەندەڵی و تاوان و داوێنپیسی نەخشاندووە، یان بە شتی دیکەی نهێنی مەترسیدار، ئەو جۆرە سەرۆکانە جێبەجێکاری بەوەفای مەبەستەکانمانن، چونکە لە ناوزڕاندن و سوکایەتی پێکردن دەترسن، بەهۆی پێشینە خراپەکانیان، هەروەها بەردەوام ملکەچی دەستەلاتی ترسن، هاوکات ئەو پیاوانەی گەیشتوونە دەستەلات خاوەنی سەرمایە و موڵکن، بۆیە سەرۆك هەوڵدەدات دەستکەوت و سەروەرییە پەیوەستەکانی بە پێگە باڵاکەی بۆ بمێنێتەوە و لەدەستیان نەدات.

لە نزیکترین کاتدا ئەنجوومەنی نوێنەرانی گەل ( The House of Representative)، خۆی سەرۆك هەڵدەبژێرێت و دەیپارێزێت.

بەلام رێگەنادەین ئەنجوومەنەی گەل دەستەلاتی پێشکەش کردنی پرۆژە یاسا و هەمووارکردنەوەی هەبێت[1]. ئەو دەستەلاتەی بە سەرۆکە بوکەڵەکەی دەستی خۆمان دەدەین، سەرۆك بەتەواوی بوکەڵەی یارییپێکردنی(Mare puppet) دەستی ئێمە، بەو شێوەیە دەستەلاتی سەرۆك دەبێتە ئامانجی هێرشە جیاوازەکانی گەل، لەبەر ئەوەی گاڵتەی بەژیان و داهاتووی چین و توێژەکانی گەل دەێت، بەلام

---

[1]- ئایە کام وڵاتی خۆرهەلاتی ناوەڕاست لە ئێستادا ئاوا نییە؟ بەلام پرسی گرنگ ئەوەیە، ئایە هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ بە دیاریکراوی لە وڵاتانی ناوچەکە دەگوزەرێت، پلانی جووەکانە!!!؟

لەبەر ئەوەی سەرۆك یاریە بەدەستی خۆمان، ئامرازی بەرگریكردنی پێدەدەین، ئەوە هەقیقەتە سەرۆك پێداچوونەوە بەو بڕیارانە دەكات كە فەرمانڕەوایی گەلی پێدەكات، چونكە سەرۆك لە سەروی نوێنەرانی گەلە، یان سەرۆك بە خودی خۆی بڕیارەكان دەردەكات، بە واتایەكی دیكە سەرۆك ئەو دەستەڵاتەی هەیە، پەرلەمان هەڵبوەشێنێتەوە، كەسانی دیكە بە ویستی خۆی بكات بە ئەندامی پەرلەمان و نوێنەری خەڵك، بەو پێیە خەڵك كۆیلەی كوێری ئێمەن، كە زۆرینەیان بەربەری و هیچ و پوچ و بێكەڵكن.

بۆئەوەی سەرۆك دەستەڵاتی رەهای هەبێت، دەستەڵات بە سەرۆك دەدەین، تاكو حوكمی سەربازی رابگەیەنێت، ئەم دەستەڵاتەی سەرۆك روون دەكەینەوە، لە هەقیقەتدا سەرۆك – سەرۆكی سوپایە، پێویستە سەرۆك مافی فەرمانڕەواییكردنی سوپای هەبێت، بۆ پارێزگاریكردن لە دەستوری كۆمارە نوێیەكەی، پارێزگاریكردن لە دەستور ئەركی سەرۆكە، لەبەر ئەوەی نوێنەر و بەپرسی كۆمارە نوێیەكەیە.

١٤– ئەوە بەرچاورِوونی تێگەیشتنە لە كلیلی بارودۆخی فەرمانڕەوایكردن درۆزنانە كە لەدەستی ئێمەدایە، لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە هیچ كەس بێجگە لە ئێمە بۆ ماوەیەكی ئەوەندە درێژ كۆنترۆڵی دەستەڵاتی یاسادانانی نەكردووە.

١٥– كاتێك ئێمە دەستوری كۆماری نوێ دەخەینەروو، ئەنجوومەنی نوێنەران(پەرلەمان) لە دانانی دەستورە نوێیەكە بێبەش دەكەین، بەو

بیانوەی دەستور نهێنی دەوڵەتە، هاوکات مافی ئەوەیان پێنادەین پرسیار لەبارەی مەبستی ئەو پلانانە بکەن کە حکومەت دایاندەنێت.

سەرۆکی بوکەڵە، بەو دەستورە نوێیە ژمارەی نوێنەرانی گەل لە ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ کەمترین ژمارە کەم دەکاتەوە، بەو شێوەیە ژمارەی نوێنەران لە ئارەزووی سیاسی و پەیوەسبوون بە سیاسەت کەمدەبێتەوە، ئەگەر نوێنەرە دوورخراوەکان لە دژمان وەستانەوە، رێگە بە نوێنەرە ماوەکانی ناو ئەنجوومەنی نوێنەران دەدەین ببن بە راوێژکاری گەل، سەرۆکی کۆمار مافی هەیە، سەرۆك و جێگر بۆ ئەنجووومەنی نوێنەران دابمەزرێنێت، هەروەها جێگر بۆ ئەنجووومەنی پیران دابمەزرێنێت، دانیشتنە بەردەوامەکانی پەرلمان دەگۆڕین بۆ دانیشتنی ماوەکورت، وادەکەین دانیشتنەکانی پەرلەمان چەند مانگ جارێك بۆ ماوەیەکی کورت کۆببێتەوە.

هەروەها سەرۆکی کۆمار بەو پێیەی سەرۆکی دەستەڵاتی جێبەجێکردنە، مافی بانگهێشتکردن و هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی هەیە، کاتێك ئەو مافەی هەیە، ئەوە مافی داواکردنی پەرلەمانێکی نوێ هەیە، بەڵام لە هەردوو حالەت سەرۆکی کۆمار بەپرسیارێتی ئەنجامی ئەو کارانەی ناکۆکە لەگەڵ دەستور دەگرێتە ئەستۆی خۆی، لەبەر ئەوەی هەڵوەشانەوەی پەرلەمان و داواکردنی بۆ پەرڵەمانێکی نوێی سەرپێچیەکی رەهای دەستوورە، هەڵبەتە پێش ئەوەی پلانەکەمان تەواو بێت و پێبگات، بە پۆست و دراو وەزیرەکان و فەرمانبەرە کارگێڕیە

گەورەکانی دیکەی دەووری سەرۆك فریودەدەین، بۆ ئەوەی فەرمانەکانی سەرۆك فەرامۆش بکەن، هاوکات ڕێنمایی لەلای خۆیان دەربکەن، بەو شێوەیە وەزیر و فەرمانبەری یەکە کارگێڕیە گەورەکان ناچاردەکەین لە بری سەرۆکی دەوڵەت بەرپرسیارێتی ئەنجامی کارەکانی سەرۆك هەڵبگرن، هاوکات ڕێنماییان دەکەین، بە تایبەتی ئەو ئەرکە بە ئەنجوومەنی پیران یان ئەنجوومەنی شوارى دەوڵەت یان ئەنجوومەنی وەزیران بدەن، بە پێچەوانە نابێت ئەو ئەرکە بە تاکەکان بدەن، سەرۆك بە ڕێنمایی ئێمە تەفسیری یاساکان دەکات، دەکرێت تەفسیرەکانی سەرۆك چەندین تێگەیشتن بە دەستەوە بدات. هاوکات سەرۆك دەتوانێت یاساکان هەڵوەشێنێتەوە، لە حاڵەتێکدا پرسی هەڵوەشاندنەوەی یاساکان ویستراو بێت، هاوکات سەرۆك مافی هەیە، یاسای کاتی نوێ پێشنیار بکات، ڕێکاری هەموارکردنەوە کاری دەستووری حکومەتە، کاتێك حکومەت پێویستی بەو کارەیە، ئەگەر پرس هەڵوەشاندنەوەی یاساکان و هەموارکردنەوەی دەستور بۆ بەختەوەری وڵات بێت.

١٦- نموونەی ئەو ڕێکارانە، وادەکات وردەوردە هەموو ئەو ماف یان پێگانە بەدەست بهێنینەوە، کە پێشتر ناچاربووین بیدەین بە سەرۆك، بە تایبەتی ئەو کاتەی دەستمان بەسەر دەستەڵاتدا نەگرتبوو. ئەو ماف و شانازیانەی بەدەستمان هێناوە، دەیخەینە نێو دەستووری وڵات، بۆ پڕکردنەوەی هەموو مافە دەستوورییەکانی لە مێژوودا هەمانبووە، بەو شێوەیە کاتێك - کاتی گۆڕینی هەموو حکومەتە بونیادنراوەکان دێت، لە

پێناوی حکومەتە ئۆتۆکراتییەکەمان، پاشا ئۆتۆکراتییەکەمان بناسە، ئەو دەتوانین پێش هەڵوەشاندنەوەی دەستووری حکومەتەکان، لێکۆڵینەوە لە پاشا ئۆتۆکراتییەکەمان بکەین.

١٧- بەوپەڕی پێداگری مەبەستم ئەوەیە، بزانی فەرمانڕەوایی ئێمە لەو چرکە ساتە دەستپێدەکات: کاتێك ئەو خەڵکە هاوار دەکەن ناکۆکی و جیاوازییەکان پارچە پارچە و لەت لەتیان دەکات، هەروەها ئازاردەبینن بەهۆی ئیفلاسی سیاسی و ئابووری فەرمانڕەوا بوکەڵەکەمان، هەڵبەتە هەموو ئەو نەفرەتی و نەهامەتیانەی خەڵك ڕووبەڕووی دەبنەوە(لەسەر دەستی ئێمە ڕێکخراوە و پلانی بۆ دانراوە).

١٨- خەڵك بە گشتی هاوار دەکەن و داوادەکەن: "ئەم فەرمانڕەوایانە لەسەر دەستەڵات لابدەن، یەك فەرمانڕەوای زانامان بۆبێنن، بتوانێت یەکمان بخات، هەموو هۆکارەکانی ناکۆکی نێوانمان بسڕێتەوە، هۆکاری ناکۆکییەکانمان: "سنور و نەتەوەکان و ئاین و قەرزی نێودەوڵەتی و ..." تێپەڕاندووە، هەروەها هاواردەکەن و داوادەکەن فەرمانڕەوایەکمان پێبدەن: ئاشتی و ئارامیمان بۆ دەستەبەر بکات، ئەو ئاشتی و ئارامیە لە سایەی حکومەت و سەرۆکە بوکەڵەکانمان و نوێنەرەکانمان، هەرگیز ناکرێت هەبێت.

١٩- بەڵام ئێوە ئەی فەرمانڕەوایانی جوو، بە ڕەهایی تێدەگەن و دەزانین، بۆ ئەوەی خەڵك بە گشتی بەو شێوەیە لەبەردەممان هاوار بکات و بکروزێتەوە، بێگومان پێویستە لە هەموو وڵاتانی شڵەژانی پەیوەندی

نێوان گەل و حکومەت بەردەوامبێت، هەروەها ناکۆکی و شەڕ و رق و مردن بەردەوامبێت، لەپاڵ برسیەتی و هەژاری و بڵاوبوونەوەی پەتا و نەخۆشی، هەموو ئەو بەڵا و نەفرت و نەهامەتیانە دەگەن بە ئاستێك، گەلانی ناجوور هیچ دەرچەیەك یان رێگاچارەیەك بۆ دەرچوونیان لەو نەفرەت و نەهامەتیانە نابینن، تەنها ئەوە نەبێت پەنامانپێبگرن و بەچۆکدابێن و رووبکەنە دارایی و دەستەڵاتە کامیل و تەواوەکەی ئێمە.

٢٠- ئەگەر ئێمە کات بە نشتمانپەروەرکان بدەین هەناسەیەکی ئارام - پشوویەك بدەن، ئەوە هەموو شتێك لەدەست دەدەین، ئەو دەرفەتە جارێکی دیکە بۆ ئێمە دووبارە نابێتەوە، کەواتە نابێت بەزەییمان هەبێت و دەرفەتی هەناسەی ئارام و پشوو بە نەتەوییەکانی دیکە ناجوور بدەین.

## پرۆتۆكۆلی یازدەم:

## عەرشی دیكتاتۆری:

:(The Totalitarian State)

١- ئەنجوومەنی دەوڵەت(State Council) دەستەڵاتی فەرمانڕەوا جیادەكاتەوە و تەفسیر دەكات، ئەو ئەنجوومەنە، وەكو دەستەیەكی یاسادانانی فەرمی توانا و دەستەڵاتی هەیە، كۆمەڵەیەكن فرمان بۆ ئەوانە دەردەكەن كە لەسەر دەستەڵاتن.

٢- ئا ئەوە پرۆگرامی ئەو دەستورە نوێیەی ئێمەیە كە بۆ جیهانمان داناوە، ئێمە یاساكان دادەنێن، هەروەها مافە دەستووریەكان دیاری دەكەین، بەو ئامرازانە جێبەجێیان دەكەین:

١- فەرمانی ئەنجوومەنی یاسادانانی پێشنیاركراو لەلایەن سەرۆكی دەوڵەت.

٢- پەیوەستبوون بە فەرمانی گشتی و فەرمانی ئەنجوومەنی پیران و ئەنجوومەنی شوارى دەوڵەت و بڕیارەكانی ئەنجوومەنی وەزیران.

٣- پەیوەستبوون بە كودەتای سیاسی(Cuop detat) تاكو ساتی گونجاو دروست دەبێت.

٣- ئەوە ئامرازەكانی جێبەجێكردنمانە، لەگەڵ نەخشەی رێژەییمان لەسەر پلانی كارەكانمان، دانووستانی ئەو بەشانەی پلانی كارەكانمان

دەکەین، کە پێویستە بۆ ئێمە، بۆ ئەوەی شۆڕش لە کۆمەڵێك بەش یان لقی دەزگاکانی دەوڵەت بەپێی ئەو ئاراستەیە روویدات، کە پیشتر روونم کردەوە، مەبەستم لەو بەشانە: "ئازادی رۆژنامەگەری، مافی پێکهێنانی دەزگا و رێکخراوی ناحکومی، ئازادی بیروباوەڕ، هەڵبژاردنی نوێنەرانی گەل، ..."، هەروەها چەندین مافی دیکە لە ژیانی ئاسایی مرۆڤ بوونیان نابێت، بەڵام هەموو ئەو مافانە چیتر لە ژیانی مرۆڤ وون نابن، بەڵکو لە رۆژی دووەمی راگەیاندنی دەستوری نوێی لە بنەماوە دەستور دەگۆڕین، ئێستا ئێمە لە سات و کاتی دیاریکراوەین، بەپێی پلانی دانراومان ئامادەین و لە هەموو روویێك پارێزراوین، بەڵام بۆ ئەوەی هەموو گۆڕانکارییەکان رابگەیەنین، هۆکارێکی دیکە هەیە، ئەو گۆڕانکاریانەی هەموو ساتێك گەل هەستی پێدەکات، بە مسۆگەری ترسناکە، لەبەر ئەوەی ئەگەر گۆڕانکارییەکان بە توندوتیژی و زەبروزنگ بوون، هەروەها بەبێ پاساوی یاسایی سەپاندمان، ئەوە خەڵك بێزار دەکات، بەو شێوەیە خەڵك لە ئاراستەی گۆڕانکاری نوێی هاوشێوەی گۆڕانکارییەکانی رابردوو دەترسن، لە روویێکی دیکە، ئەگەر گۆڕانکارییەکان دەرفەتی سودێکی زیاتر بە گەل ببەخشێت، ئەوە خەڵك دەڵێن: ئێمە هەڵەکانی پێشووی خۆمان زانی، ئەوە وادەکات دەستەڵاتە نوێیەکە خۆی لە هەڵەکردن بەدوور بگرێت، یان لەوانەیە بڵێن: ئێمە لەسەر ملکەچبوون ئابڕومان بردراوە و بێزراین و قێزمان لێکرایەوە یان بەرنەفرەت کەوتووین، لەو حالەتە جیهان سوپاسمان ناکات، هەروەها جیهان بەخۆیان دادەچنەوە، مافی خۆیانە ملکەچی ئەو دەستەڵاتە بن کە

خۆیان گەرەکیانە، ئەگەر هەر یەك لەو کاریگەریانە لەسەر ئەقڵیی گشتی جێگیر بوو، ئەوە مەترسییەکی باڵا دەکەوێتە سەر دەستوری نوێ.

لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە، پێویستە لە ساتی یەکەمی ڕاگەیاندنی دەستوورە نوێیەکەدا ئاگاداربین، بەڵام تاکو ئێستا خەڵك لە شوێنەوارەکانی گۆڕانکاری چاوەڕواننەکراو ئازار دەچێژێت، چونکە خەڵك لە حالەتی سوکایەتی پێکردن و ئاژاوەدان، بۆیە دەزانن و تێگەیشتووین ئێمە بە مەزنترین هێزی تۆکمە و پڕ لە توندوتیژی ستوونی گەیشتووین، هەروەها دڵنیان بە ڕێزەوە سەیری بەرژەوەندییەکانیان ناکەین، دەمەوێت نەتەوەییەکان تێبگەن، ئێمە بۆچوون و ئارەزووەکانیان ڕەتدەکەینەوە، بەڵکو لە هەموو کات و شوێنێك ئامادەین بە دەستێکی بوێر و بەتوانا هەر ئاماژەیەك یان دەستەواژەیەك بۆ ئۆپۆزسیۆن بوون بخنکێنین.

دەمانەوێت خەڵك تێبگات، ئێمە دەستمان گرتووە بەسەر هەموو ئەو شتانەی ویستوومانە، ئێمە لە هیچ حالەتێك لە حالەتەکان ڕێگەنادەین نەتەوەییەکانی دیکە لە دەستەڵاتدا هاوبەش بن لەگەڵماندا، ئەو کاتە نەتەوەییەکانی دیکە بەهۆی ترسان چاویان لە ئاستی هەموو شتێك دەنوقێنن، بە ئارامی چاوەڕوانی پێشکەوتن لە داهاتوویێکی دوور دەکەن.

٤- ((نەتەوەییەکانی دیکەی نا جوو، وەکو مێگەلن، ئێمەش گورگین))، ئایە دەزانن مەڕ چی دەکات، کاتێك گەلە گورگ دێتە ناو مێگەلەکە؟

٥- مەڕەکان چاویان لە هەموو شتێك دەنقوێنن، گورگەکان بەرەو ئەو چارەنووسە پاڵیان دەنێن کە چاوەڕوانیان دەکات، بەڵام ئێمە پەیمان بە نەتەوەییەکانی دیکەی نا جوو دەدەین، دوای ئەوەی کۆتایی بە دوژمنانی جیهان دەهێنین، هەروەها هەموو هۆزەکان ملکەچ دەکەین، ئازادیەکانیان بۆ دەگێڕینەوە.

٦- هەڵبەتە پێویست ناکات پێتان رابگەیەنم، تاکو کەی چاوەڕوانییەکانیان درێژە دەکێشێت، تاکو ئازادیە ونبووەکەیان بۆ دەگەڕێتەوە.

٧- چی هۆکارێك هانیداوین ئەو سیاستە دابهێنین، تاکو نەتەوەییەکانی پێ (تلقین) بدەین؟ ئێمە ئەو سیاسەتەی خۆمان بە نەتەوەییەکانی ئەورووپا راگەیاندووە، بەبێ ئەوەی رێگابدەین درکی مەغزا شاراوەکانی بکەن، چی وایکردووە بەتوانین بێسنور لەسەر ئەو رێگایە بمێنینەوە، ئێمە نەژادێکی پێداگرین بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانمان بە رێگایەکی راست - هەروەها بە فرۆفێڵ سەردەکەوین؟ ئا ئەوە هۆکارێکی ڕاست و دروستە، رەسەنایەتی لە رێکخستنی ماسۆنیماندایە، ئەو رێکخستنە ماسۆنییەی بەرازە نەتەوەییەکان تێیناگەن، لەبەر ئەوەی گەمژەن و گومان لە مەبەستەکان ناکەن، ئەوانمان خستە نێو گێژاوی رەوتەکەمان، رەوتەکەمان شتێك لە ماسۆنییەت زیاتر نییە، بۆ ئەوەیە خۆڵ بکەینە چاوی هاوڕێکانیان لە نەتەوەکانی دیکە.

٨- به سۆز و بەزەیی خودا گەلی هەڵبژێردراو بڵاوبووەوە، ئەو بڵاوبوونەوەیە وایکرد لەبەردەم جیهان لاواز دەرکەوین، بەڵام هەموو هێزمان بە نەگۆڕی گەیشت بە ناوەندی دەستەڵاتی باڵا[1].

٩- ((بۆ دانانی پلان لەسەر ئەو بنەمایە، لەوە زیاترمان لەدەستدا نییە، بۆ ئەوەی بگەین بە ئامانجەکامان)).

## پرۆتۆکۆلی دوازده:

---

[1] - ئەو دەقەی جووەکان زۆر راستە، جووەکان بە هەموو وڵاتانی جیهان بڵاوببوونەوە، لەگەڵ هاوڵاتییانی هەموو وڵاتێکدا، وەکو خەڵکی ئەو وڵاتە رەفتاریان دەکرد و خۆیان دەگونجاند، هاوکات لە هەموو وڵاتانی جیهان خەڵکی خۆیان هەبوو، جووەکان گاڵتە بە سیاسەتی هەموو ئەو وڵاتانە دەکەن کە ژمارەیان تیایدا زۆرە، بۆ نموونە لە: (بەریتانیا، ئەمریکا، روسیا) ئەو وڵاتانەیان بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان بەکارهێناوە و کاریگەریان لەسەر سیستەمی سیاسی و دەستەڵاتی فەرمانڕەوایی هەبووە ، هەموو جوویێکی نیشتەجێبوو لە هەر وڵاتێکی جیهاندا، بە ئاشکرا یان بە نهێنی سەر بە رێکخراوێکی نهێنی سەهیۆنی بووە، بەردەوام بۆ بەرژەوەندی و ئامانج و مەبەستەکانی دەوڵەتی باڵای سەهیۆنی کاریانکردووە.

# دەستگرتن بەسەر رۆژنامە و بلاوکراوەکان:

:(Control of thc Press)

١- دەتوانین چەمکی ئازادی بە دیدگای جیاواز تەفسیری بکەین.

٢- ئێمە بەو شێوەیە دەیبینین: ئازادی: مافی کارکردنی رێگا پێدراوە بەیاسا، پێناسەکردنی چەك بەو ئاراستەیە سودی بۆ پرسەکەمان دەبێت: پێناسەی ئازادی ماوەمان پێدەدات بلێین: ئازادی لەکوێیە؟ پێویستە کەی نەبێت؟ ئەو تێگەیشتنە هۆکارێکی سادەی هەیە، یاسا رێگەپێنەدراوە، تەنها بەو کارانە نەبێت ئێمە ئارەزووی دەکەین.

٣- لەسەر ئەو مێتۆدە هەڵسوکەوت لەگەڵ رۆژنامەکان دەکەین، ئەو رۆڵە چییە، رۆژنامەگەری لە سەردەمی ئێستادا دەیبینێت؟ رۆژنامەکان هەڵدەستن بە بزواندنی سۆزی چاوچنۆکی خەڵك، هەندێکجار رۆژنامەکان جەدەل و چەڵەحانێی حیزبی خۆپەرستانە دەوروژێنن، لەوانەیە بۆ مەبەستەکانمان پێویست بێت، رۆژنامەکان لەوانە زیاتر هیچی دیکەیان نییە، بابەتەکانی دیکەیان بێبنەما و ستەمکار و بێبەزەیی و زیادەن، زۆربەی خەڵك درکی کەمترین مەبەستە راست و دروستەکانی رۆژنامەکان دەکەن، ئێمە لە رێگای نوێنەرەکانمان رۆژنامەکان دەڕازێنینەوە و بە یەك جڵەو بەڕێوەیدەبەین، هەروەها پێویستە دەستمان بە بەڕێوەبردنی ناوەندەکانی دیکەی بلاوکراوەکان بگات، تەنها کۆنترۆڵکردنی هەفتەنامە

و رۆژانامەکان سودی نابێت، لەبەر ئەوەی بەردەوام رووبەڕووی هێرشی بڵاوکراوە و کتێبەکان دەبینەوە.

بەرهەمی بڵاوکراوە بە نرخەکان لە سەردەمی ئێستا دەگۆڕین، داهات و قازانجەکەی دەگێڕینەوە بۆ حکومەتەکەمان، لە رێگای پێشکەش کردنی پسوڵەی باجی دیاریکراو، هاوکات بۆ بڵاوکردنەوە و چاپکردنی بابەتەکان، نووسەران ناچاردەکەین بڕێك پارە بۆ دڵنیایی پێمانبدەن، بۆ ئەوەی حکومەتەکەمان لە هەموو جۆرە هێرشێك بپارێزین کە لەلایەن رۆژنامەکان دەکرێت، ئەگەر لەلایەن نووسەرێك هێرش کرایە سەر حکومەتەکەمان، لە هەموو رووێك پێبژاردن(غقرامة)ی بەسەردا دەسەپێنین، رێکارەکانی وەکو دانان و سەپاندنی "باج و دڵنیایی و پێبژاردن" دەبنە داهاتێکی گەورە بۆ حکومەتەکەمان، بەدڵنیایی رۆژنامە حزبییەکان ئامادەنین بڕی (غەرامەی)زۆر بە حکومەت بدەن، لەبەر ئەوە لە کاتی هێرشی مەترسیداری رۆژنامەکانیان، هەڵدەستین بە پەکخستنی هەموو رۆژنامە و بڵاوکراوەکان. هیچ کەس نییە دوای ئەوەی شکۆی بێتاوانی و بێهەڵەییمان لەکەدار دەکات، بەبێ سزا رزگاری ببێت، بە پاساوی داوای لێبوردن لە دەستەی بڵاوکراوەکان، دەڵێن: ئەو بابەتەی بڵاکرابووەوە، دوور لە رێسا و یاسا و پرنسیپەکان رای گشتی وروژاندوە. لە ئێوە دەپرسم، هزر و ئەقڵیی خۆتان ئاراستەی بڵاوکراوە هێرش بەرەکان و بڵاوکراوەکانی ئێمە بۆ مەبەستەکانمان بڵاویان دەکەینەوە

بكەن، رۆژنامە هێرش بەرەكان هێرش دەكەنە سەر ئەو خالآنەی كە دەیانەوێت لە سیاسەتماندا بیگۆڕین.

٤- لە هەقیقەتدا هەواڵەكان بەبێ تێپەڕبوونیان بە ویستی ئێمە ناگات بە خەڵك و كۆمەڵگە، هەموو ئەو هەواڵانەی تاكو ئەمڕۆ لە رۆژنامەكاندا بینومانە بەو شێوەیە بوون: هەواڵەكان جەخت لەسەر هەموو لایەكی جیهان دەكەن، لەلایەن ناوەندەكانی رۆژنامەگەری(Agencies) پێماندەدرێت ژمارەیان كەمە، وەلێ كاتێك ئێمە دەگەین بە دەستەلآت ناوەندەكانی رۆژنامەگەری و بلآوكردنەوە دێنەپاڵمان، ئەو كاتە تەنها ئەو هەواڵانە بلآودەكەینەوە كە خۆمان بڕیاریان لەسەر دەدەین.

٥- ئەگەر لەو حالەتەی ئێستا گەیشتن بە بەڕێوەبردنی كۆمەڵگەی نەتەوییەكانی نا جوو، وادەكەین نەتەوییەكانی بەو چاویلكە رەنگاوەڕنگانەی ئێمە خستوومانەتە بەرچاویان سەیری دۆخ و رووداوەكانی جیهان بكەن، ئەوەی گرنگە تاكو ئێستا هیچ بەربەستێك لە بەرەوپێشچوونماندا نییە، رێگری لە گەیشتنمان بە نهێنی دەوڵەتان بكات، نەبوونی ئاستەنگ بۆ رێگریكردن لە گەیشتنمان بە نهێنی دەوڵەتان، دەگەڕێتەوە بۆ گەمژەیی نەتەوەییەكانی دیكەی نا جوو، كەواتە هەڵویستمان چۆن دەبێت، كاتێك بە فەرمی دەزانین فەرمانڕەوایی كردنی جیهان، لە یەك كەسایەتییەكدا هەیە، ئەو كەسایەتییە ئیمپراتۆری ئێمە و فەرمانڕەوای جیهانە...؟

٦- با بگەڕێینەوە بۆ داهاتووی بڵاوکردنەوە، هەموو مرۆڤێك ئارەزوو دەکات ببێت بە نووسەری ڕۆژنامە یان نووسەری کتێب یان بابەت چاپ بکات، بۆ ئەم مەبەستە ناچارە بڕوانامە و مۆڵەت بەدەستبهێنێت، ئەگەر لەکاتی بڵاوکردنەوەی هەواڵ یان نووسین سەرپێچی کرد، ئەوە بڕوانامە و مۆڵەتی کارکردنی لێدەسەندرێتەوە. ئەو ناوەند و کەناڵانەی هەڵگری ئایدیای مرۆڤانەن، شوێنێکن بۆ ئەوەی تاکەکان دید و بۆچوونەکانیانی تیادا دەرببڕن، بە ئامرازە پەتیەکانی دەربڕینی لە دەستی حکومەتەکەماندایە، هاوکات حکومەتەکەمان کۆنترۆڵی هەموو بوارەکانی ڕاگەیاندنی کردووە، هەروەها حکومەتەکەمان خودی ناوەند و کەناڵەکانی وەکو ئامرازێکی پەروەردەیی بەکار دەهێنێت، بەو ئامرازانە ڕێگری لە گەل دەکەین، ڕەخنەیان لێدەگرین بۆ ئەوەی لە خەیاڵی ئازادیخوازی لایان بدەین، لێرەوە گەل نازانێت خەیاڵی بەختەوەری ڕێگایەکی ڕاستە بۆ گەیشتنیان بە بەختەوەری یان شاری چاك - یۆتۆپیا(Utopia)، ئەو شارە یۆتۆپیایەی سەرچاوەی هاتنە ئارای ئاژاوە و ڕقبوونەوە لە دەستەڵات بووە؟ هۆکاری پەیدابوون یان هاتنە ئارای ئاژاوە و ڕق و ئایدیای پێشکەوتنی ئازادیخوازی بووە، ئایدیای ئازادیخوازی پێشکەوتوو خەڵکی گەیاندووە بە ئایدیای تێکەڵ و ئاڵۆز بۆ ئازادبوون، بەبێ ئەوەی بتوانن سنورێك بۆ ئایدیاکانیان دابنێن، هەموو ئەوانەی پێیان دەڵێن: ئازادیخواز ئاژاوەچین، ئەوەی لە کار و ڕەفتارەکانیاندانیە، بە دڵنیایی لە ئایدیا و هزریان دایە، هەریەکێك لە ئازادیخوازەکان لەدوای ڕوویێکی ئازادی دەگەڕێن، کە خۆی گەرەکییەتی و لەگەڵ ئارەزووەکانی و

بەرژەوەندییەکانی خودی خۆی گونجاوە، بە بۆچوونی خۆی دەتوانێت ئەوە بکات کە ویستی لەسەرە، بەوپێیە هەر ئازادیخوازە کەوتووەتە دوای جۆرێك ئاژاوە و ئۆپۆزسیۆبوون، ئەو کەسە چاکترین ئازادیخوازە تەنها ئارەزووی لە ئۆپۆزسیۆنبوونە.

٧- ئێستا دانووستان و گفتووگۆ لەسەر پرسی بڵاوکراوەکان دەکەین: ئێمە بە هەمان شێواز باج بەسەر بڵاوکردنەوەکان دەسەپێنین، وەکو چۆن باجمان بەسەر هەفتەنامەکان و رۆژنامەکاندا سەپاند، یان لە رێگای سەپاندنی دەستەبەری و پارە خەواندن، بەڵام بۆ کتێبێك ژمارەی لاپەڕەکانی لە (٣٠٠) لاپەڕە کەمتر نەبێت، باجی زیاتر دەسەپێنین، کە بڕەکەی دوو ئەوەندەی قورسایی کتێبەکە بێت، کتێبی بچووك بە بڵاوکراوە دادەنێین، بۆ ئەوەی هەفتەنامە و رۆژنامەکان بە بەردەوامی دەردەچن، واتە هەفتانە و رۆژانە، کەم بکەینەوە، چونکە ((رۆژنامە و هەفتەنامەکان کاریگەرترین ژەهری بڵاوکراوەکانن)).

ئەو رێکارانەی وادەکات خەلك رقی لە کتێب ببێتەوە، برەو بە بڵاوکردنەوەی کتێبی لاپەڕە زۆر و قەبارە گەورە دەدەین، چونکە کەسانێکی کەم لە نێو خەڵکی گشتی کتێبە قەبارە گەورەکان دەخوێننەوە، هەروەها لەبەر کواڵیتی و جۆری تایبەتی چاپەکانیان، نرخی کتێبەکان بەرزدەبێتەوە، هەموو ئەو هۆکارانە وادەکەن خوێنەران نەتوانن کتێبە باشەکان بخوێننەوە، لە بەرانبەردا ئێمە بە خودی خۆمان کتێبی هەرزان لە رووی نرخ بڵاودەکەینەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی گشتی

بیانخوێننەوە، لە نووسینی کتێبەکانمان ئەقڵمان ئاراستەی ئەو بوارانە دەکەین کە خۆمان ئارەزوومانە، نموونە (بابەتی چێژبینین و بێبنەما و ڕۆمانسی).

٨- بەو پێیە سەپاندنی باج بەسەر بڵاوکردنەوەی کتێب، وادەکات نووسینی بەپێز کەم ببێتەوە، هاوکات بۆشایی لە بواری نووسین دروست دەبێت، ئامانجی سەرەکیمان لە بوونی بۆشایی لە بواری نووسیندا خودی نووسین نییە، چونکە لەبنەماوە نووسەران بەرپرسی نووسینەکانیانن لەبەردەم یاسا، هاوکات هەموو نووسەران دەخەینە ژێر چاودێری خۆمان، بەو شێوەیە هیچ نووسەرێك نابینین چیتر بە قەڵەمەکەی بنووسێت و هێرش بکاتە سەرمان و لە ڕۆژنامە و کتێبەکان بڵاوبکرێنەوە.

پێش چاپکردنی هەر جۆرە نووسینێك، پێویستە لەسەر ئەو لایەنەی بڵاویدەکاتەوە یان چاپی دەکات، بۆ بڵاوکردنەوە مۆڵەت لە دەستەڵات وەربگرێت، بەو شێوەیە هەموو پیلانێکی لە دژی خۆمان پێش وەخت دەزانین، هاوکات توانامان هەیە بە زانینی فێڵی پێشوەختی نووسەرەکە سەری پان بکەینەوە، هەروەها ڕاگەیاندنێك لەسەر نووسینەکەی بڵاوبکەینەوە. ئەدەب و ڕۆژنامە مەزنترین هێزی فێرکردنی مەترسیدارن، لەبەر ئەوە حکومەتەکەمان زۆرترین ژمارەی ڕۆژنامە بەردەوامەکان دەکڕێت و لەناو دەبات، تاکو کەمترین خەڵك بیانخوێنێتەوە. بەو ڕێگایە کاریگەری خراپی هەموو ڕۆژنامە سەربەخۆکان پەکدەخەین، بە دەستەڵاتێکی زۆر گەورە بەسەر ئەقڵیی مرۆڤ زاڵدەبین.

٩- ئەگەر ڕێگەماندا بە بڵاوکردنەوەی (١٠) ڕۆژنامە، ژمارەی بڵاوکراوەکان فروان دەبێت تاکو بۆمان دەبێت بە (٣٠) ڕۆژنامە، بەو شێوەیە زیادەکات و بەردەوام فروان دەبێت.

١٠- پێویستە گەل دڕدۆنگ نەبێت کەمترین گومان لەو ڕێکارانە بکات، کە بۆ بڵاوکردنەوە پەیڕەوی دەکەین. لەبەر ئەوە پێویستە ئەو ڕۆژنامە بەردەوامانەی خۆمان لە ڕێگەی نوێنەرەکانمان (جاسوس) بڵاویاندەکەینەوە، وادەربکەون دژی دیدگا و بۆچوونەکانمانن.

١١- بەو شێوەیە متمانە بە خوێنەرانی ڕۆژنامەکان دەدەین، هاوکات لە بڵاوکراوەکانمان دیمەن و ڕوخساری سەرنجڕاکێشی ئەو دوژمنە ئەدیب و نووسەر و سیاسی و ئایینی و کۆمەڵایەتییانە دەخەینە ڕوو، بۆ ئەوەی گومانمان لێناکەن ئەو ڕۆژنامانە لەلایەن ئێمە دەردەچێت، بەو ڕێکارە بە تێپەڕبوونی کات ناوبراون لە نووسەران و ئەدیبان و سیاسیان و ... دەبنە هاوبەشمان[1]، چونکە بە تێپەڕبوونی کات خەڵك گومانیان لێدەکات و لە هێزی گەل دادەماڵرێن یان هێزیان نامێنێت.

---

[1]- واتە نووسەرەکان بە ناچاری دڵسۆزی خۆیان بۆ جوولەکان ئاشکرادەکەن، بەو شێوەیە جوولەکان دەتوانن پەیوەندیان پێوەبکەن، ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەن وەکو ئەوەی هاوبەشیانن، بە تێپەڕبوونی کات دەیانخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان و لە بەرژەوەندی خۆیان کاریان پێدەکەنە.

رۆژنامە فەرمییەکان لە ریزی یەکەم دادەنێین، بەردەوام بە ئاگان بۆ بەرگریکردن لە بەرژەوەندییەکانمان، ئەو رۆژنامانە کاریگەریان لەسەر گەل بە رێژەیی لاوازە، رۆژنامە نیمچە فەرمییەکان لە ریزی دووەم دادەنێین، ئەرکی ئەو رۆژنامانە راکێشانی بێلایەنەکانە بۆ لای خۆمان. ئەو رۆژنامانەی دوژمنانمان لەخۆدەگرێت لە ریزی سێیەم دێن، لە یەکێك لە چاپەکانی یان ژمارەکانی نەیارەکانمانی تێدا دەردەکەوێت، دوژمنە هەقیقیەکانمان، ئەو ئۆپۆزسیۆنانەن پشت بەو رۆژنامەیە دەبەستن، لەناو ئەو رۆژنامانە بە خودی خۆیان تاوان و دەستەکانیان بۆمان ئاشکرادەکەن.

١٢- ئێمە رۆژنامەی زۆرمان هەیە، گروپی جیاواز لە: "ئەرستۆکراتییەکان و کۆمارییەکان، شۆڕگێڕەکان، ئاژاوەچییەکان" پشگیری دەکەین، هەڵبەتە تاکو دەستوورەکان بە ناچاری دابنرێن، رۆژنامانەکان وەکو خودای هیندی ڤیشنو(Vshnu)[1] سەدان لایەنگریان دەبێت،

[1] - خودای هندۆسی(براهما، تاکە بەڵام سێ ناوی هەیە، یەکێك لە ناوەکانی (ڤیشنو)یە، شوێنکەوتەکانی بەپێی رەفتارەکانیان لە گەردوون دەستی لێدەدەن لەبەردەمی نزادەکەن و داوای بەجێهێنانی ئاوات و مەبەستەکانیان دەکەن، ئەو خودایە لەسەر شێوەی مرۆڤە و سەدان دەستی هەیە، ژمارەی دەستەکانی ئامارەن بۆ کار و تواناکانی، دەستەکان بە گشتی هیمای ژیانن، زۆریان هیمای توانای گشتی و دەستگەیشتنیەتی بەسەر هەموو شتێك، بۆیە

لایەنگەرەکان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان لایەنگری رۆژنامەکانمان دەکەن، بەلاّم دەستەی نووسەرانی رۆژنامەکانمان بە هەلگەڕاوەیی تریپەکانی دلّی رای گشتی دیاری دەکەن، بە واتایەکی دیکە هەموو کەسێك بە هەلگەڕاوەیی دەست بۆ رای گشتی دەبات و لێی تێدەگات. هەر کاتێك بیەوێت تریپەکە خێرابێت، ئەوە دەستەکە رای گشتیی بە ئاراستەی مەبەستەکانمان رادەکێشێت، چونکە ئاسانە نەخۆشی مێشك ماندو، بەویستی خۆت ئاراستە بکەی، هەروەها ئاسانە بکەوێتە ژێر کاریگەری هەر جۆرێك لە جۆرەکانی خەلّك، کاتێك چەنەباز و زۆر بلّێیەکان تۆمەت دەبەخشنەوە، کەواتە خەلّك پێویستیان بە راو بۆچوونی رۆژنامە حیزبییەکان نییە، لە هەقیقەتدا رای تایبەتی ئێمەیان گەرەکە، یان ئەو رایەیان گەرەکە کە ئێمە دەمانەوێت، ئەو چەنەبازانە وادەزانن شوێنی رۆژنامە حیزبیەکەی خۆیان کەوتوون، بەلاّم لە هەقیقەتدا شوێنی یاریەك کەوتوون لە سەروی حیزب دەیانجوولّێنێت یان ئاراستەیان دەکات.

١٣- بۆ ئەوەی سوپا رۆژنامەوانییەکەمان بە پشتیوانی گروپە جیاوازەکان رۆحی ئەو بەرانامەیە بۆ دەرخستن جێبەجێ بکەن، پێویستە لەسەرمان رۆژنامەکانمان زۆر بە وردی رێکبخەین.

---

خەلّکی بۆ هەموو حەز و ئاوات و مرازێك دەچنە بەردەمی و کڕنۆش دەبەن و دەستی لێدەدەن.

بۆ ئەم مەبەستە، بەناوی دەستەی ناوەندی رۆژنامەوانی( Central Commission Of the Press)، کۆبوونەوەی ئەدەبی رێکدەخەین، بەبێ ئەوەی ئاگاداری نوێنەرەکانمان بکەین، ئاماژە بە دەستەبەری(countersigns) و وشەی نهێنی(Password) دەکەن، لە رێگای گفتووگۆکردن لەسەر سیاسەتەکانمان و دژایەتی کردنی رۆژنامەوانەکان، بە بەردەوامی وەك پێویست بە رووکەش، بێ ئەوەی زیان بە واقیعی بەشە گرنگەکان بگەیەنن، ئەندامانمان بەردەوام دەبن لە جەدەل و گفتووگۆی لاوەکی تیۆری، لەگەڵ رۆژنامە فەرمییەکاندا، بۆ ئەوەی پاساومان پێبدەن، تاکو پلانەکەمان بە وردی دادەنێین، تاکو بتوانین لە راگەیاندنی پەرلەمانی پلانەکەمان رابگەیەنین،

١٤- هەڵبەتە ئەو کۆبوونەوە ئەدەبییە پێویستە بۆ بەرژەوەندییەکانمان بەکاربهێنین، هەروەها دژایەتییەکان لەپاڵ کاری رۆژنامەوانی خزمەت بە مەبەستەکانمان بکات، بەو شێوەیە خەڵکی باوەڕدەکەن ئازادی قسەکردن بەردەوامە، هەروەها دەرفەت بە نوێنەرانمان(Agents) دەدات، بتوانن بڕوا بەخەڵك بهێنن، کە نەیارەکانمان بەبێ بنەما تاوانبارمان دەکەن، هاوکات نەیارەکانمان ناتوانن بنەمایەکی هەقیقی بۆ ئەو تاوانانە بدۆزنەوە کە لەدژمان هەڵیانبەستاوە، تاکو پشتی پێببەستن بۆ رەخنەگرتن لە سیاسەتەکانمان و تێکشکاندنیان.

١٥- ئەو ڕێکارانە تێبینییەکانی سەر ئاگایی خەڵك دەسڕێتەوە، هەروەها سەرکەوتووترین ئامراز و ڕێگایە بۆ سەرکردایەتی کردنی ئەقڵیی خەڵك، هەروەها بۆ زیندو کردنەوەی بڕوا و متمانەی خەڵك بە حکومەتەکەمان.

بەهۆی ئەو ڕێکارانە دەتوانین ئەقڵیی گەل بوروژێنین و لە پرسە سیاسییەکان ئارامی بکەینەوە، بە تایبەتی ئەو کاتە پێویستە لەسەرمان ئەو کارە بکەین، کە دەتوانین لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانمان رازیان بکەین یان بیانخەینە کێشە، بە چاپکردنی هەواڵی ڕاست یان هەڵبەستراوی درۆ، واتە لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی هەواڵی هەقیقەت یان دژی هەقیقەت بەپێی گونجاویان لەگەڵ مەبەستەکانمان.

کەواتە ئەو هەواڵەی بڵاویدەکەینەوە پشت دەبەستێت بە شێوازی گەل، بەو شێوەیە گەل هەواڵەکان پەسند دەکات، ئاگامان لە خۆمان دەبێت، وەلێ زۆر بەئاگایانە ((زەوی ئاقیدەکەینەوە پێش ئەوەی لەسەری بڕۆین)).

ئەو کۆت و بەندانەی دەیسەپێنینە سەر بڵاوکراوە تایبەتەکان، وەك بینیمان، یارمەتیمان دەدات لە سەرکەوتن بەسەر دوژمنەکانمان دڵنیابین، چونکە هیچ ئامراز و هۆکارێکی ڕۆژنامەگەری لە ژێر دەستیاندا نییە، تاکو بتوانن بە هەقیقی دید و بۆچوونەکانیان دەربڕن، ئێمە ناچارنین ئامرازی ڕۆژنامەگەری بخەینە بەردەستیان، ئەگەر بۆ کاری جێبەجێکردنی هەموو پرسەکانیشیان بێت.

١٦- لەو وتارە بێ واتایانەی(Ballon dessai) لە ڕۆژنامەكانی ڕیزی سێیەم بڵاویاندەكەینەوە، كۆتایی بە لێبوردنەكان دەهێنین، لە كاتی پێویست بە نیمچە فەرمی سزاكان جێبەجێی دەكەین( __ Semi officallyـ).

١٧- ئێستا ڕۆژنامەكانی فەڕەنسا لەسەر بەرنامەی تێگەیشتنی ماسۆنی بەڕێوەدەچێت، بۆ پێدانی ئاماژەی دڵنیابوون، هەموو ئەندامانێكی ڕۆژنامەكان لەسەر شێوازی كانزای كۆن(Ancient oreles)، بە نهێنی ئاڵوگۆڕی پێشەیی بەیەكەوە بەستراونەتەوە، هیچ یەكێك لە ئەندامەكان نهێنیەكانی دەیزانێت ئاشكرا ناكات، نموونەی ئەو نهێنیانە لەلایەن هیچ كەس پەخشناكرێت بەسەر ئەندامەكانی دیكە، هیچ ڕۆژنامەنووسێك بۆی نییە، بەتاك ئازایانە ئەو نهێنییانەی پەیمانی پاراستنی داوە ئاشكرا بكات، هۆكارەكەی ئەوەیە ڕێگە بە كەس نادرێت بێتە نێو جیهانی ئەدەب، ئەگەر لە ژیانی ڕابردوی هەڵگری هەندێك ئەدگاری((Marks)) ڕیسوایی یان شەرمەزاری (Shady) نەبێت. كەواتە پێویستناكات كەمترین هێمای ماسۆنیی بوونی خۆی دەربخات، تاكو كەسی بەرانبەری بە خێرایی ئەدگاری ڕیسوایی یان شەرمەزاری خۆی ئاشكرا دەكات، بەڵام ئەو ئەدگارە ناسراوانە، كە تایبەتمەندی ژمارەیەكی كەمە بە نهێنی دەمێنێتەوە، بە پێچەوانە ڕۆژنامەوانە ماسۆنییە گەورەكان بە شكۆی ڕۆژنامەوانی ڕای گشتی لە هەموو وڵات بۆ خۆی ڕادەكێشێت، خەڵكی ڕەخنەی لێدەگرن و سەرسامی دەبن.

١٨- پێویستە لەسەرمان بە تایبەتی پلانەکەمان بۆ ناو هەرێمەکان (Previnces) درێژبکەینەوە، هەروەها پێویستە ئایدیا بخولقێنین، هەڵبەتە جۆرەها بۆچون و ئایدیا ئامادەبە، دەتوانین لە هەر کاتێك بمانەوێت ئەو بۆچوون و ئایدیایانە دابەزێنین بۆ پایتەخت، هاوکات وەکو بۆچوون و ئایدیای جیاواز لە هەرێمەکانی دیکە پێشکەشی بەرپرسانی پایتەختی وڵاتی بکەین.

بێگومان سەرچاوە و رەسەنایەتی ئایداکەمان ناگۆڕێت: مەبەستم ئەوەیە سەرچاوەی ئایدیاکانمان خۆمانین، ئەرکە لەسەرمان پێش ئەوەی دەسەڵات بسەپێنین، هەندێکجار شارەکان لەژێر بۆچوونی هەرێمەکاندابێت، واتە هەرێمەکان هەڵگری بۆچوونی زۆرینە بێت، ئەو پلانەی لە پێشدا ئێمە دامانڕشتبوو، پێویستە بۆ ئێمە لەو ماوەیەدا پایتەخت بەو بۆچوونەی هەرێمەکان نەزانێت، بۆ ئەوەی کاتی نەبێت گفتوگۆی هەقیقەتی بۆچوونە جیاوازەکان بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی بە ئاسانی سەرجەم بۆچوونە جیاوازەکان پەسند بکات، لەبەر ئەوەی زۆرینەی هەرێمەکان بۆچوونیان جیاوازە لەگەڵ پایتەخت.

بەو پێیە دەگەین بە سەردەمی مێتۆدی نوێی، یان لەو ماوەیە دەچینەوە بۆ وڵاتی خۆمان، پێویستە رێگە بە رۆژنامەکان نەدەین، شرۆڤەی رووداوە تاوانکارییەکان نەکەن، بەڵام پێویستە گەل باوەڕبکات مێتۆدی نوێی بە ئاستێك سەرکەوتووە کە تاوانکاری زیادی کردووە، هەروەها

پێویستە ئەو ڕووداوە تاوانکاریانەی ڕوودەدەن، تەنها قوربانییەکان ئەوانەی ڕێکەوتووین لەسەری بە زانینی تاوانەکان ئازار دەکێشین بزانن.

## پرۆتۆکۆلی سێزدە:

## سەرقاڵکردن:

## :(Distractions)

١- پێویستە ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکاندا هەواڵی ڕقلێبوونەوە لەلایەن نەتەوەییەکان (Goyim) بۆ خەڵك هەبێت، بەبەردەوامی ڕقلێبوونەوە لە دەستەڵات و یەکدی وێردی سەرزمانیان بێت، تاکو ئەو نەفرەتیانە لە خزمەتماندا بمێننەوە، ئەو نەتەوییانەی لە ڕۆژنامەکانماندا کاردەکەن و بەکاریاندەهێنین، بە ویستی ئێمە گفتووگۆ لەسەر هەندێك پرس دەکەن، ئەو پرسانە لەلای خەڵك ویستراو نینە، تاکو لە ڕۆژنامەکانماندا ئاماژەیان پێبکەین، بە تایبەتی لە ڕۆژنامە (Gazette) فەرمییەکانمان ئاماژەیان پێبکەین، بەڵام هەموو دەستوێژ و هۆکارێکی گفتووگۆ و دانووستان بەکاردەهێنن، لەکاتی گفتووگۆ و دانووستانەکانادا ئەو یاسایانە جێبەجێ دەکەین کە پێویستمان پێیانە، یاساکان دەخەینە بەردەمی خەڵك، بەو واتایەی یاساکان هەقیقەتی بەرجەستە و جێبەجێکراون.

دوای ئەوەی یاساکان دەخەینە بواری جێبەجێکردن، کەس ناوێرێت داوای پێداچوونە و هەموارکردنەوە بە یاساکاندا بکات، بە تایبەتی کاتێك دەردەکەوێت جەخت لەسەر پێشخستنی یاساکان دەکەین، هاوکات ڕۆژنامەکانمان تێڕوانینی خەڵك لەسەر کێشە نوێیەکان دووردەخەنەوە،

هەڵبەتە(ئێوە بەخودی خۆتان دەزانن، ئێمە بە بەردەوامی گەل فێردەکەین، لەدوای کێشەی نوێ بگەڕێت)، هاوکات سەرکێشە سیاسیە گەمژەکان پەڵەدەکەن، بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کێشە نوێیەکان، هەروەها ئەو هاوڵاتیانەی لە ئەمڕۆدا تێناگەن، هاوشێوەی سیاسییە گەمژە سەرکێشەکان چەلەحانێ لەسەر کێشەکان دەکەن. مەبەستمان ئەو کێشە سیاسیانەیە، کە خەڵکی ئاسایی لێی تێدەگەن، هەروەها مەبەستمان لەو کێشە سیاسیانەیە کە خەڵکی ئاسایی ناتوانن درکی مەقیقەتەکەی بکەن و لێیان تێبگەن، واتە خەڵك بەبێ ئەوەی مەقیقەتی پرسە سیاسییەکان بزانن گفتووگۆیان لەسەر دەکەن، بەڵکو تەنها ئەو فەرمانڕەوایانە دەتوانن لێیان تێبگەن کە خۆمان بە دەستەڵاتمان گەیاندوون.

٢- فەرمانڕەواکان ئەوانەن لە سەردەمانێکی زۆر زووەوە ئەزموونی تێپەڕاندنی دۆخەکانیان کردووە، تێکەڵی سیاسەت بوونە، بۆ ئەوەی لە هەموو ئەو پرسانە تەواوبین، کاتێك رایگشتی بەدەستدەهێنین، بەو ئاراستەیە کاردەکەین، بۆ ئەوەی کاری دەزاگاکانمان (Machinary) ئاسانتر بکەین، تێبینی بکەن: ئێمە داوای رەزامەندی لەسەر هەموو پرسەکان دەکەین، بەڵام بە قسە، نەك بە پراکتیکی، واتە رەزامەندی تیۆریمان لەسەر پرسەکان گەرەکە. ئێمە لەسەر هەموو رێکارەکانمان جەخت لەسەر پەیوەستبوون بە هیوا و بەقین دەکەین، بۆ بەرژەوەندی گشتی.

٣- بۆ ئەوەی خەڵکی ئاژاوەچی بە گفتووگۆی پرسە سیاسییەکان سەرگەردان بکەین، بەرەو کێشەی نوێیان ببەین، یان بەرەو کێشەی "پشەسازی و بازرگانیان" ببەین، دوای ئەوەی دەکەونە ناو جەڵەحانێ لەسەر ئەو کێشە نوێیانە، لێیاندەگەڕێن وەکو خۆیان پێیان خۆشە بە گفتووگۆ و دانووستان جەخت لەسەر ئەو پرسانە بکەن.

لەگەڵ خەڵکی گشتی هاوڕادەبین، لە چالاکی سیاسی دوورکەنەوە و وازبهێنن، ئەگەر رابواردن یان کات بەسەربردنێکی نوێمان پێدا، یان بازرگانیمان پێدا، بەو شێوەیە هەوڵدەدەین خەڵك باوەڕبکەن بازرگانیش پرسێکی سیاسییە، ئێمە بە خودی خۆمان هانی خەڵکی گشتیماندادوە بەشداری لە سیاسەتدا بکەن، بۆ ئەوەی پشتیوانیان لە شەڕکردنمان دژی حکومەتە نەتەوەییەکان مسۆگەر بکەین.

بۆئەوەی گەل دوور بخەینەوە لەوەی بتوانێت هەر هێڵێکی کاری نوێ بە خودی خۆی بدۆزێتەوە، بە جۆرەها رابواردن و یاری وکایەکانی کات بەسەربردن و کۆڕ و کۆبوونەوەی گشتی فرویان دەدەین.

بە خێرایی لە رۆژنامەکان دەستدەکەین بە راگەیاندن، بانگی خەڵك دەکەین بۆ چوونە نێو پێشبڕکێ و هەموو جۆرە پرۆژەیەکی دیکە: وەکو"هونەر، وەرزش، ..."، ئەو شادی و خۆشیانە لە پێشبڕکێ و پرۆژە هونەرییەکانی دەیبینن، بەبێگومان هزری گەل لەو پرسانەی لەسەری جیاوازین لەگەڵمان دوور دەخاتەوە، کاتێك گەل هەنگاو هەنگاو لە رێگای شادی و خۆشیبینین بیرکردنەوەی سەربەخۆی خودی لەدەست دەدات،

هەموو گەل لەگەڵ ئێمە لەبەر یەك هۆکار دەنگیان بەرز دەکەنەوە: دەڵێن ئەوە ئێمەین ئەندامی یەك کۆمەڵگەین، بەو شێوەیە ئامادەن بۆ پێشکەش کردنی هێڵی بیرکردنەوەی نوێ. ئەو هێڵەی دەیخەینە روو بە دەستەبەرکردنی ئەو میکانیزمەی پێیی گەیشتووین.

٤- لەگەڵ نموونەی ئەو پارتە ئازادیخوازانەی ناتوانین گومان لە هاوپەیمانێتیان بکەین. رۆڵی کەسە ئازادە باڵاکان کۆتایی دێت، کاتێك حکومەتەکەمان دەناسن، ئەو کەسانە تاکو ئەو کاتەی حکومەتەکەمان دەناسن خزمەتێکی باشمان پێدەکەن.

لەبەر ئەو هۆکارە هەوڵدەدەین ئەقڵیی گشتی ئاراستەی هەموو جۆرە تیۆرێکی فەنتازی (Fantastic) بکەین، بەو شێوەیە خەڵك واتێدەگات بووە بە کەسێکی پێشکەوتوو یان ئازادییخواز، ئێمە بە تیۆرەکەمان سەرکەوتنی تەواو و مسۆگەرمان لە رێگەی گۆڕینی ئاراستەی سەر خاڵی لە ئەقڵیی نەتەوەییەکان رووەو ئاراستەی سۆسیالیسی بەدەستهێناوە، چونەکە لە نێو نەتەوەییەکاندا یەك ئەقڵ نییە، بتوانێت تێبینی بکات، لەپشتی چەمك و وشە بریقەدارەکان، سەرگەردانی و لادان لە هەقیقەت خۆی مەلاسداوە، تەنها ئەو حاڵەتانە نەبێت، کە چەمك و وشە ئاماژە بە دۆزینەوە ماددیەکان یان زانستییەکان بکەن، لەبەر ئەوەی لەنێو ئەم حاڵەتەی دووەم فێربوونی یەك هەقیقەت هەیە، کە داهێنانە لە پێناوی پێشکەوتن، دەرفەتێکی دیکە نییە، ئەگەرچی پێشکەوتنی ماددی نەتەوەیەکان بیرۆکەیەکی بێکەڵکە و کاردەکات لەسەر پەردەپۆشکردنی

هەقیقەت، بۆ ئەوەی کەس لە هەقیقەت تێنەگات، تەنها ئێمە نەبین — ئێمە گەلی هەڵبژێردراوی خوداین، خودا ئێمەی پاڵاوتووە، تاکو نەتەوەیەکی لەسەر هەق بین، بە ماددە هەڵناخەڵەتێین و خۆمان لەیاد ناکەین.

٥- کاتێك دەستدەگرین بەسەر دەستەلاتدا، گوتاربێژەکانمان گفتوگۆ لەسەر کێشە و پرسە گەورەکان دەکەن، ئەو کێشە و پرسانەی مرۆڤایەتی سەرسام دەکەن، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا جۆری مرۆڤ (بەشەر)، بکەوێتە ژێر فەرمانڕەوایی پیرۆزی ئێمە.

٦- کێ گومان دەکات ئێمە ئەو کێشانەمان بەپێی پلانی(Scheme) سیاسی وروژاندوە، چونکە((مرۆڤایەتی بۆ ماوەی چەندین سەدە تێناگات، ئەوەی روویداوە بەپێی پلانی داڕێژراوی ئێمە بووە)).

# پرۆتۆکۆلی چواردە:

## هێرشکردنە سەر ئایین:

## (Assault on Religion):

١- کاتێك بە خودی خۆمان پێدەگەین، دەبین بە گەورەی زەوی، ڕێگە نادەین هیچ ئایینێك دابمەزرێت، تەنها ئایینی خۆمان نەبێت، ئەو ئایینەی دانیناوە بە یەکایەتی خودا و چانسی ئێمەی بە هەڵبژاردنی خۆی بەستووەتەوە، هەروەها چارەنووسی جیهان بە ئایینەکەمان بەستراوەتەوە.

لەبەر ئەو هۆکارە پێویستە لەسەرمان هەموو بڕوایەکی ئایینی تێکبشکێنین، ئەگەر ئەنجامی تێکشکاندنی بڕوا ئایینیەکانی دیکە کاتیش بێت، گرنگ نییە، لەبەر ئەوەی بڕوا ئایینەکانی دیکە بەرهەمی گومڕاکانە و ناکەونە چوارچێوەی بابەتەکانی ئێمە، بەڵام نموونەیەك بۆ نەوەکانی داهاتوو دەخەمەڕوو، ئەو نەوانەی گوێ لە وانەکانمان لەسەر ئایینی (موسا) دەگرن، هەڵبەتە (موسا) ئێمەی کردووە بە نوێنەری بڕوا ئایینیە یەکلاکەرەوەکەی خۆی، کەواتە ئەرکە هەموو نەتەوەیەك ملکەچی ژێر پێمان بێت.

ئەگەر ئەو ئامانجەمان هاتەدی، ئەوە خۆمان بۆ هەقیقەتی ناخەکی (Mystic truths) بڕوای پەروەردەیی موسا تەرخان دەکەین،

ئەو هەقیقەتە ناخەکیانەی بڕوای موسایی لەسەر دامەزراوە، هاوکات دەڵێین: بڕوای ئایینی موسا هەموو هێزەکەی پەروەردەییە.

دوای ئەوەی فێری بڕواکانی موسا دەبین، لە هەموو دەرفەتێکی گونجاو، وتاری بەراوردکاری لە نێوان فەرمانڕەوایی سودبەخشمان و ئەو فەرمانڕەواییانەی پێش خۆمان بڵاودەکەینەوە، ئەو کاتە دۆخی راستی و ئاشتی و ئارامی باڵدەکێشێت، ئەگەرچی ئەو دۆخە نوێیە لەدایکبووی ئاژاوە و ناکۆکی چەندیدن سەدەیە، هاوکات چاکەکانی فەرمانڕەوایی نوێی ئێمە دەردەکەوێت، وێنای ئەو هەڵانە دەکەین، نەتەوەییە (نا جووەکەکان) بە ویستی خۆیان بە خراپترین رەنگ ئەنجامیان دابوو.

بەو شێوە دەستدەکەین بە وروژاندنی هەستی بێزاری بە ئاراستەی مێتۆدی فەرمانڕەوایی پێشو، تاکو گەل حکومەتی "ئاشتی و ئارامی" بەرزتر لە کەشی کۆیلایەتی بۆ ئازادی بنرخێنێت، ئەو ئازادییەی بە بەردەوامی شانازی پێوەدەکات، ئەو ئازاردییەی ئازاری زۆریان لەسەری چەشتووە، هاوکات لەپێناوی پرسی ئازادی سەرچاوەی بوونی مرۆڤایەتییان لەدەستداوە، دەپرسین کێ پاڵینان بۆ بەدەستهێنانی ئازادی؟ تەنها کۆمەڵێك لەو سەرکێشانەی کە بەخودی خۆیان نازانن چی دەکەن!

گۆڕانکاریکردن لەو حکومەتە بێکەڵکانەی نەتەوەییەکانمان پێ فریودابوو، بەردەوامدەبین لە بچووکردنەوە دەوڵەتەکانیان، ئەوە لە کاتێکدا دەبێت گەلان بە تەواوی بێزار و بێ هیوا و بێ ئومێدن، بە

ئاستێك گەلان ئامادەن هەموو ئازارێك بچێژن، لەبەر ئەوەی دەترسن دووبارە بگەڕێنەوە بۆ ئەو کوێرەوەری و بێهیوایەی لە رابردودا پێیداتێپەڕیون، چونکە دەترسن دووبارە فەرمانڕەوایی پێشویان بۆ بگەڕێتەوە.

٢- چاودێری تایبەت ئاراستەی ئەو هەڵە مێژوویانەی حکومەتە نەتەوەییەکان دەکەین، کە مرۆڤایەتییان بۆ ماوەی چەندین سەدە زۆر ئازار داوە، بەهۆی ناتەواوی تێگەیشتنیان بۆ هەموو شتێك، کە لەگەڵ بەختەوەری هەقیقی بۆ ژیانی مرۆڤایەتی بگونجێت، نەتەوەییەکان بەدوای پلانێکی جووان بۆ بەختەوەری کۆمەڵایەتی دەگەڕان، بەڵام نەتەوەییەکان تێبینیان نەکرد، پلانەکەیان لەبری ئەوەی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان چاکتر بکات، بە پێچەوانە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانیان خراپتر و خراپتر کرد، لە هەقیقەتدا پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان بنەمای سەرەکی بوونی خودی مرۆڤایەتییە.

٣- لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە هەموو هێزی پرانسیپ و رێکارەکانمان، بە پەنهانی لە نێو ئەو هەقیقەتەدایە بۆ مرۆڤایەتی رامانگەیاندووە، لەگەڵ ئەوەی بە تەواوی دژی مێتۆدی هەڵوەشاندنەوە و لەناوبردنی حالەتە کۆمەڵایەتییەکانی پێشوە.

٤- فەیلەسوفانمان یەکسانی هەموو ئایینە نەتەوییەکانی دیکەی (نا جوو) دەهیچێنن و ریسوادەکەن، بەڵام بە ئەبەدی هیچ کەس لە دیدگایەکی هەقیقی بڕیاری لەسەر ئایینەکەمان نەداوە، کەواتە بە ئەبەدی

هیچ کەس نەیتوانیوە، بە سەرجەمی لە بنەماوە ئایینەکەمان بناسێت، تەنها گەلە تایبەتەکەی خۆمان نەبێت، بنەمای ئایینەکەمان دەناسن، بەڵام گەلە تایبەتەکەی خۆمان ئامادە نییە، نهێنی ئایینەکەمان ئاشکرا بکات.

٥- لە هەموو وڵاتێکی گەورەی خاوەن سەروەری، ئەدەبی (Literature) نەخۆشی قێزەونمان بۆ لاوازکردنی پێگەی جەماوەریان بڵاوکردەوەتەوە، دوای ئەوەی دان بە دەستەڵاتمان دادەنێن، بۆ ماوەیەکی کورت بەردەوام دەبین، لەسەر پاڵپشتی سەروەر بوونی نموونەی ئەو ئەدەبە نەخۆش و قێزەونە، هاوکات بۆ ئەوەی جەماوەر بە روونی ئامازە بە جیاوازی ئەو بڕوایانەی ئێمە بکات، لە هەڵوێستی ستایشکراومان سەرچاوە دەگرێت، هاوکات زانایانمان ئەوانەی بۆ مەبەستی سەرکردایەتی کردنی نەتەوەییەکان پەروەردەکراون، هەڵدەستن بە پێشکەشکردنی وتار و داڕشتنی پلان و نووسینی راپۆرت، بەو شێوەیە بەردەوام دەبین تاکو کاردەکەینە سەر ئەقڵیی پیاوەکانیان و سەرنجیان بۆ ئەو مەعریفە و ئایدیایانە رادەکێشین، گونجاوە لەگەڵ مەبەستەکانی ئێمە.

## پرۆتۆکۆلی پازدە:

## چەوساندنەوەی بێبەزەییانە:

## :(Ruthless Suppression)

١- کاتێك لە کۆتاییدا دەگەین بە دەسەڵات، بە هەموو هێز و توانای لەبەردەستماندایە کاردەکەین بۆ ڕێگریکردن لەو پیلانگێڕیانەی لە دژمان ڕێکدەخرێن، بە ژمارەیەك کودەتای سیاسی(coups detat) چاوەڕواننەکراو بەردەوام دەبین، کودەتاکان ڕێکدەخەین بۆ ئەوەی لە یەك کاتدا لە هەموو وڵاتان ڕووبدات، کاتێك کودەتاچییەکان حکومەت ڕاگەیەنن، ناتوانن فەرمانڕەوایی گەل بکەن، ئاژاوە سەرهەڵدەدات، ئەوکاتە ڕاستەوخۆ زۆر بەخێرایی دەستدەگرین بەسەر دەسەڵاتدا، بەڵام ماوەیەکی درێژ لە کات تێدەپەڕێت، پێش ئەوەی لە کۆتاییدا بگەین بەو دەسەڵاتەی مەبەستمان و پلانمان بۆ داناوە، لەوانە ئەو ماوەیەی پێویستە تاکو بگەین بە کۆتا دەسەڵات، سەدەیەکی بێبەزەیی بێت بۆ هەموو ئەو گەلانەی دەست بۆ چەك دەبن لەدژی جێگیری و ئارامی دەسەڵاتمان.

پێکهێنانی هەر کۆمەڵەیەکی نهێنی نوێی سزاکەی مردنە، بەڵام ئەو کۆمەڵە نهێنیانەی لە ئێستادا پێکدەهێنرێن و ئێمە دەیانناسین، خزمەت دەکەن و خزمەتی مەبەستەکانمانیان کردووە، هەڵیاندەوەشێنینەوە و ئەندامەکانیان دوور دەخەینەوە بۆ ناوچەیەکی دابڕاوی جیهان، هەروەها

لەگەڵ هەموو یەکێك لە ماسۆنییە ئازادەکانی نتەوەییەکانی دیکەی (نا جوو) هەمان هەڵوێست دەگەرینەبەر، لەگەڵ ئەوەی دەزانین زیاد لەپێویست گونجاون بۆ ئاسایش و ئارامی ئێمە، هەروەها ئەو ماسۆنییانەی لەوانەیە لەبەر هۆکارێك یان لەبەر هەر هۆکارێکی دیکە لێیان ببورین، لە مەترسیی بەردەوامی دوورخستنەوە دەیانهێڵینەوە، یاسایەك دەردەکەین بۆ گرتنی ئەندامە ماسۆنییەکانی پێشومان کە لە ریکخراوە نهێنییەکانی ئەوروپا کاریان کردووە، هەموویان لە ئەوروپا دوور دەخەینەوە، لەبەر ئەوەی ((ئەوروپا دەکەین بە ناوەندی حکومەتەکەمان)).

٢- بڕیاری حکومەتەکەمان کۆتا بڕیارە، یەك کەس مافی دژایەتی کردنی بڕیارەکانی ئێمەی نییە.

٣- بۆ ئەوەی وەڵامی هەموو کۆمەڵە و گروپە نەتەوەییەکان لەسەر یاخیبوونیان بدەینەوە، بە خراپ بیانگۆڕین، ئەو کۆمەڵە و گروپانەی بە قوڵی ناکۆکی و پرنسیپی رەوتی ئۆپۆزسیۆنی پرۆتستانمان (Protestant) بۆ ئیۆزسیۆنبوون خستبووە نێویان، بێبەزییانە سزایان دەدەین، ئەو شێوە سزادانانە وادەکات گەلان تێبگەن، ناکرێت دەستدرێژی بکرێتە سەر دەستەڵاتمان، پێویستە بۆ لەناو بردنیان قوربانی زۆر نەدەین، چونکە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن لە داهاتوودا دەیانکەین بە قوربانی.

گەیشتن بە سەركەوتن، ئەگەرچی بە قوربانی زۆر پێی گەیشتووین، بەڵام ئەركی هەموو حكومەتێكە بەدەستی بێهێنێت، مەرجەكانی سەركەوتنی حكومەت لە نێو دەستكەوتەكاندا پەنهان و شاراوە نییە، كە شانازی پێوەدەكات، بەڵكو لە نێو جێبەجێكردنی ئەركەكانیدایە.

بەوپێیە مەرجی سەرەكی بەردەوامی و ئارامی حكومەت، لە بەهێزكردنی شكۆی دەسەڵاتەكەی بەرجەستە دەبێت، ئەو شكۆیەی بەردەوامی و ئارامی حكومەت بەرجەستە دەكات، ناتوانین پێی بگەین، تەنها بە هێزێكی گەورە نەبێت، بە پێچەوانە بە هێزێكی ترسنۆك و لەرزۆك (Unshakable) نابێت، ئەو هێزە خاوەنی شكۆ و پیرۆزییە، هەرگیز شكۆی پێشێڵ ناكرێت، هاوكات هێزەكەمان دەورەدراوە بە هێزی ناخەكی(Mystic)، بۆ ئەوەی نموونەی دادوەری و توانای خودا بێت.

بەو شێوەیە لە زووەوە تاكو ئێستا ((ئۆتۆكراسی روسیاییەكان(Russian Autoxiacy) دوژمنی یەكمانە))، ئەگەر كەنیسەی پاپایانی پیرۆز(Holysee) بەدوور بگرین، بیركەوە كاتێك ئیتالیا بەخوێن سور ببوو، بەڵام دەستیان بۆ یەك تاڵە موی سەری سیلا(Sulla)[1] نەبرد، هاوكات ئەو پیاوە هۆكاری رژانی خوێن بوو،

---

[1]- سیلا: نموونەیەكی دەگمەنە بۆ هەر كەسێك كە دەگاتە دەسەڵاتی رەها، لە رێگای كودەتا و توندوتیژی، یەكەم رۆژی دەركەوتنی حكومەتی كۆماری لە رۆما، ئەو كاتەبوو كە سەركردەی رۆمانی ماریۆس؛ لە ساڵی (١٠٧. پ. ن) كاتێك سیلای نارد بۆ گفتوگۆ كردن لەگەڵ پاشای مەغریب لە باكوری

ئەگەرچی لەئەنجامی خۆبەزلزانی کەسايەتی سيلا شەڕ و ئاژاوە دروست ببوو، بەلآم سيلا مايەی چاوتێبڕين و خۆشەويستی گەل بوو، ئەو چاوتێبڕينەی گەل وايكرد سيلا بەبێ ترس بە پيرۆزی بگەڕێتەوە بۆ ئيتاليا و شكۆی نەشكێنرا، گەل زيانی بەو كەسايەتييە نەگەياند، كە بەئازايەتی و هێزی ئەقڵيی خۆی جادوی (huphoneses) لە گەل كرد.

٤- بێگومان ئەو رۆژە دێت كە دەستەلآت دەگرينە دەست، هەوڵدەدەين شانەی ماسۆنييە ئازادەكان لە هەموو لايەكی جيهان گەشە پێدەين و زياد بكەين، سەرنجی هەموو ئەو كەسانە رادەكێشين دەتوانن ببن بە كەسايەتی يان ناسراون و خاوەنی رۆحی گشتين(Pubicspirit)، واتە كارلێزمان، ئەو شانەيەی ماسۆنييەكان شوێنێكی سەرەكی دەبێت،

---

ئەفريقيا، سيلا سەركەوتوو بوو لە رۆڵەكەی، كاتێك ماريۆس بووە سەرۆكی حكومەتی رۆما لە ساڵی (١٠٤ پ. ن)، سيلا سەركردەی سوپاكەی رۆما بوو، هاوكات فرمانی لە ماريۆس وەردەگرت، تاكو لە ساڵی (٨٧ پ. ن) سيلا بە سوپاكەی روويكردە رۆمای پايتەخت، ئەنجوومەنی پيران رقيان لێی دە بووەوە بێتە سەر دەستەلآت، هەروەها ماريۆس و هەندێك لە شوێنكەوتەكانی رەتيان دەكردەوە دەستەلآت بۆ سيلا جێبهێڵن، بەلآم سيلا توانی بگات بە دەستەلآت، لە سەرەتادا خەڵك رقيان لێی دەبووەوە، لەبەر ئەوەی خوێنی زۆری رشت، بەلآم دوای ئەوەی دۆخەكەی ئارامكردەوە، ياسای بەرقرار كرد، خەڵكی بە سەرۆكی حكومەتيان دەزانی و رێزيان لێی دەگرت.

بەرپرسیارێتی ئەو هەواڵانەی پێدەدەین کە دەمانەوێت، هاوکات چاکترین ناوەندی راگەیاندن و ریکلام کردنی ئێمە دەبێت.

هەموو ئەو شانانەی ماسۆنییەت دەخەینە ژێر یەك سەرکردایەتی ناسراو، ئەو سەرکردایەتییە تەنها بەخۆمان دەیکەن، ئەو سەرکردایەتییە لە زاناکانمان پێکدەهێنین، هەروەها شانەکان نوێنەری تایبەتیان هەیە، کە لەدەرەوەی سەرکردە ماسۆنییەکانن، بۆ ئەوەی شوێنی نیشتەجێبوونی سەرکردە هەقیقییەکانمان بشارینەوە، تەنها ئەو سەرکردایەتییە مافی دانانی وتەبێژ و وێنەکێشانی سیستەمی ئەمڕۆی هەیە، هەروەها پەتا و بەڵا دەخەینە نێو هەموو شانە سۆسیالیستییەکان و چینی کۆمەڵگەی شۆڕشگێڕان، هاوکات زۆربەی پلانە سیاسیە نهێنییەکانیان لەلای ئێمە زانراون، کاتێك پلانەکان تەواودەبن یارمەتی جێبەجێکردنیان دەدەین.

هەموو نوێنەرەکان(Agents) بە ناوی پۆلیسی نێودەوڵەتی بە نهێنی کاردەکەن، زۆربەیان ئەندامن لە شانەکانی ماسۆنی. خزمەتی پۆلیسی گرنگی زۆری بۆ ئێمە هەیە، لەبەر ئەوەی دەتوانن ببن بە پەرژینێك بۆ پرۆژەکەمان(Enterprises)، چونکە دەتوانن لێکدانەوەی ئەقڵانی بۆ بێزاری و تورەیی نێوان گروپ و خێڵەکان هەڵبهێنجن، هەروەها سزای ئەو کەسانە دەدەن، رەتیدەکەنەوە ملکەچی ئێمە بن.

٥- زۆربەی ئەوە خەڵکانەی دێنە ناو رێکخراوە نهێنییەکان، کەسانی سەرکێشن و ئارەزوو دەکەن هەر چۆنێك بێت کاروانی ژیان تەواو بکەن، مەیلیان لە هەوڵ و تێکۆشان و ماندووبوون نییە، نموونەی ئەو جۆرە

خەڵکانە، لەسەر ڕێنمایی ئێمەن و شوێنی مەبەستەکانمان دەکەون، وایانلێدەکەین جووڵێنەر یان بزوێنەری دەزگاکەمان بن.

کاتێك هەموو جیهان بەدەستی ئاژاوە و شڵەژان دەناڵێنێت، دۆخی شڵەژانی گشتی تەنها ئامازەیە، بۆ ئەوەی پێویستە ئاوا بیانشڵەژێنین، تاکو یەکێتی و تۆکمەیی نێوانیان تێکبدەین و لەناو ببەین. کاتێك پیلانەکانمان دەستپێدکەن، واتە یەکێك لە بەهێزترین نوێنەرە دڵسۆزەکانمان سەرکردەی ئەو پیلانە دەکات، سروشتی نییە ئێمە تاکە گەل بین، پرۆژەی ماسۆنیی ئاراستەبکەین، بەڵام ئێمە تاکە گەلین دەزانین چۆن ئەو پرۆژەیە ئاراستە دەکەین، هەروەها ئێمە ئامانجی کۆتایی هەموو کارێك دەزانین، بەڵام نەتەوەییەکانی دیکەی (نا جوو) نەزانن سەبارەت بە زۆربەی پرسە تایبەتییەکانی ماسۆنییەت، هاوکات ناتوانن روخساری ئەو ئەنجامە خێرایانە ببینن کە خودی خۆیان ئەنجامیدەدەن، بە گشتی نەتەوییەکان تەنها بیر لە سودی کاتی ئەو شتانە دەکەنەوە کە پشتی پێدەبەستن، کاتێك لوتبەرزیان تێردەبێت، دەگەن بە مەبەستەکەیان چیتر بیرناکەنەوە، تێناگەن ئایدیای رەسەن ئایدیای ئەوان نییە، بەڵکو ئێمە بە خودی خۆمان پێمان راگەیاندوون.

٦- نەتەوەییەکان راران لەسەر بێکەڵکی شانەکانی ماسۆنیی یان راران لەسەر هیوای بەدەستهێنانی پشك لەو شتە باشانەی لە نێو رێکخراوە ماسۆنییەکاندا بەئەنجام دەگات، هەروەها نەتەوەییەکان لەدوای سۆزی سەرکەوتن و شادی و خۆشی چاك دەگەڕێن، ئێمە سۆز و شادی و خۆشی

بە ڕێکەوت و بە خێرایی و بێسنور دابەش دەکەین، لەبەر ئەوە ئازادیان دەکەین، لەناو سۆز و شادی و خۆشییەکانیان باڵەفڕێبکەن، بۆ ئەوەی بە هەموو هەستی لەخۆبایبوونیان ڕووبەڕووی خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانیان ببنەوە، ئەوانەی لە بێئاگایی و ساتی گەمژەیی ئایدیا و بیرۆکەکانمان دەنۆشن یان دەخۆنەوە، متمانەیان بە ڕاستی بێ هەڵە و بێ تاوانی کەساياتی خۆيان هەیە، واتێدەگەن هەرگیز هەڵە ناکەن و تەنها خۆیان خاوەنی دید و بۆچوونی هەقیقین، هەروەها وادەبینن یان واتێدەگەن لە ژێر کاریگەری کەسانی دیکەدا نەبوونە و نابن.

ئێوە ناتوانن وێنای ئەوە بکەن چۆن بەئاسانی لێهاتووترینی نەتەوەییەکان بۆ حاڵەتی پێکەنینی سادە و بێئاگایانە پاڵدەنێین(Naivite)، لە ڕێگای وروژاندنی خۆبەگەورەزانین و سەرسام بوونی بە خودی خۆی، لە ڕوویێکی دیکە چۆن بەئاسانی ئازایەتی و توانای خۆی زۆر بە سادەیی و بێ هیوایی جێگیر دەکات، ئەگەر بە سادەیی لە ڕێگای بێدەنگبوون لە ئاستی ڕووداوەکان بۆ چاکترکردن ئاستی شادی و خۆشییەکانەیەتی، بەو شێوەیە پاڵی دەنێین بۆ حاڵەتی ملکەچبوونی ڕیسوایی، وەکو ئەو کۆیلە داماوەی هیوای سەرکەوتنی نوێی لەدەستداوە، بە ڕێژەی ڕقبوونەوە لە گەڵ ئێمە ڕقیان لە سەرکەوتنە، هەروەها کەم سەیری پلانە بەرجەستەبووەکەیان دەکەن، نەتەوەییەکان حەزیان لە سەرکەوتنە، ئامادەن بە هەموو پلانەکانیان قوربانی بدەن لە پێناوی سەرکەوتن.

ئەو دیاردەیەی(Feature) لە ئەخلاقی نەتەوەییەکانی دیکەدا هەیە، وادەکات لە کارەکانمان حەزنەکەین کاریان لەگەڵ بکەین، لەبەر ئەوەی نەتەوەییەکان خۆیان وادەردەخەن کەسانی رۆشنبیرین، بەڵام وەکو مەڕ گێژن، کەڵەی سەریان پڕە لە گەمژەیی.

لێیاندەگەڕێین لە خەونەکانیان بەردەوام بن و سواری ئەسپی هیوا نەزۆك و بێبنەماکانیان ببن، بۆ تێکشکاندنی تاکایەتی مرۆڤ، بەدانانی ئایدیای هێمای بۆ پرنسیپە کۆمەلایەتییەکان(Collectivism)، واتە وادەکەین خەڵك بە یەکسانی خاوەنی هەموو شتێك بێت، بەڵام کەس بە کردار پسپۆڕی تایبەتی نەبێت، نەتەوەییەکان هێشتا تێنەگەیشتوون – تێناگەن، خەونی وشتر ئاسایان، دژی بنەمای یاسای سروشتییە، چونکە کاتێك خودا دەستی بە بەدیهێنان کرد، هەموو بوونەوەرێکی جیاواز لە هەموو بوونەوەرێکی دیکە ئافراند، بۆ ئەوەی هەر بوونەوەرێك رەهەندی تایبەت بە خۆی هەبێت، لەسەر ئەو بنەمایە هەربوونەوەرێك لە بەراورد بە جۆری خۆی و جۆرەکانی دیکە تاکێکی سەربەخۆیە و رەهەندی تایبەت بەخۆی هەیە.

٧– لە هەقیقەتدا ئێمە دەتوانین نەتەوەییەکان پاڵبنێین بۆ تەبەنی کردنی نموونەی ئەو ئایدیا هەڵەیەی مرۆڤەکان یەکسانن، واتە بۆ تەبەنی کردنی ئایدیای یەکسانی نێوان مرۆڤەکان، لەبەر ئەوەی بە روونی هێزی وێنا و بۆچوونی بەرتەسکی خۆیان بۆ ژیانی مرۆڤایەتی دەبەلگێنن، ئەگەر بە

وێنا و بۆچوونی خۆمانیان بەراورد بکەین! لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە هیوای گەورە بۆ سەرکەوتنمان بەرجەستە دەبێت.

٨- ئێمە تێڕوانین و دیدگای فەرمانڕەوا پێشینەکانمان بەدوور ناگرین، کاتێك پێیان ڕاگەیاندین، بۆ گەیشتن بە مەبەستی گەورە و مەزن، بەراستی پێویستە بۆ یەکسات لەبەردەم ئامرازەکانی گەیشتن بە مەبەستەکانمان نەوەستین، هەروەها گرنگی نەدان بە ژمارەی ئەو قوربانیانەی پێویستە بیانکەن بە قوربانی، بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانیان، ئێمە هەرگیز پشتنابەستین بەو قوربانیانەی لە نەوەی ئاژەڵانن، واتە نەوەی نەتەوییەکانی دیکەی (ناجوورەکەن)، لەگەڵ ئەوەی ئێمە قوربانی زۆرمان بە خودی گەلەکەمان داوە، بەهۆی ئەو قوربانیانەی لە خودی گەلەکەمان پێشکەشمان کردووە، ئێستا پێگەیەکمان لە جیهاندا هەیە، کە پێشتر خەونمان بەو پێگەیە دەبینی پێی بگەین، هەڵبەتە قوربانییەکانی لە نەوەکانی خودی گەلەکەمان داومانە بە ڕێژەیی کەمە، قوربانییەکان گەلەکەمانیان لە وێرانبوون و لەناوچوون پاراستووە.

٩- بێگومان هەموو مرۆڤێك کۆتای بە مردن دێت، بۆیە چاکترە پەلەبکەین لە کۆتاییهێنان بەو مرۆڤانەی ڕێگری ئاستەنگ بۆ مەبەستەکانمان دروست دەکەن، نەك بەو مرۆڤانەی مەبەستەکانمان پێشدەخەن.

ئێمە ماسۆنییە ئازادەکان بە شێوازێك بەرەو مردن دەبەین، یەك کەس ناتوانێت بەو شێوەیە بەرەو مردنیان ببات، تەنها برا - کەمترین گومان

له هەقیقەتی کارەکە دەکات، بەڵام قوربانیەکان پێشکات بە خودی خۆیان گومان لە کۆتایی خۆیان ناکەن، ئەوانە هەموویان دەمرن — کاتێك پێویستە، لە ڕووی دیاردەیی مردنێکی سروشتییە، تەنانەت براکانیش ئەو هەقیقەتەی مردن دەزانن، ناوێرن پاسا و لەسەر مردن بهێننەوە.

بە نموونەی ئەو ئامرازە رەسەنایەتی ڕیشەی خودی بەڵگەکەمان لە دژی فرمانەکانمان لە بواری ماسۆنییە ئازادەکان گرنگی پێدەدەین یەکلا دەکەینەوە، ئێمە لەلای نەتەوەییەکانی دیکەی نا جوو ڕێبازی ئازادیخوازی رادەگەیەنین، لە ڕوویێکی دیکە گەلەکەمان لە ملکەچبوونی تەواو یان کامیل دەپارێزین.

١٠- بە کاریگەری ئێمە یاسای نەتەوەییەکان بە کەمترین شیمانە شیاوەی پەیڕەوکردنە، لەسەر ئەو تێگەیشتنە شکۆی یاسای نەتەوەییەکانمان بە ئایدیای ئازادی شێواندوە، چەندین دەقی یاسا شێواومان ئاخنیوەتە نێوان یاسا دانراوەکانی نەتەوەییەکان، گرنگترین دەقی یاسایی ترسناك، پرسی دەقە سیاسی یان ئەخلاقییەکانە، دەقی ئەو پرسانە بریار دەدەن لەسەر رۆڵی دادەوەر، بەو رێگایەی ئێمە ڕوونی دەکەینەوە کاربکات، ئەو دادوەرە نەتەوەییەی کاری دادوەری دەکات، لەسەر بنەمای دەقەکانی ئێمە دامانناوە، دەڕوانێتە دۆخەکان و ماددەکان هەڵدەبژێرێت، ئەو تێگەیشتنەمان لە بەردەوامبوونی نوێنەرەکانمان بەرجەستەکردووە، هەروەها لە بەردەوامبوونمان لەگەڵ کەسانێك کە هیچ پەیوەندیان بە ئێمەوە نەبووە، وەکو لە ڕێگای وتاری

رۆژنامەکان و ئامرازەکانی دیکە، بەڵام ئەندامانی ئەنجوومەنی پیران(Senators) و گەورە فەرمانبەرەکان کوێرانە شوێنی ئامۆژگارییەکانمان دەکەون.

ئەقڵیی نەتەوەییەکان لە بنەماوە سروشتێکی ئاژەڵی پەتی هەیە، ناتوانێت شیکاری و تێبینی هیچ شتێك بکات، تەنها بۆچوون و پشێبینی، لەسەر درێژبوونەوەی دۆخێك لە دۆخەکان دەبێت، ئەگەر لەژێر رۆشناییەکی دیاریکراودا دۆخەکە روون بووەوە.

١١- وەڵێ ئەو جیاوازیە رەهاییەی لە نێوان ئەقڵیی ئێمە و نەتەوەییەکاندایە، بە ئاسانی پرسی هەڵبژاردنمان لەلایەن خودی خوداوە بۆ ئاوەڵا دەکات، ئێمە خاوەنی سروشتێکی جیاوازین، سروشتی ئێمە لە سەروی سروشتی مرۆڤە(Superhuman natury)، کاتێك ئەقڵیی خۆمان بەراورد دەکەین بە ئەقڵیی زگماکی ئاژەڵی نەتەوەییەکان، ئەوان گرفتی تێگەیشتن لە هەقیقەتیان هەیە، پەی بە هەقیقەت نابەن، ناتوانن هیچ داهێنانێك بکەن، بەڵکو لە شتە ماددییەکان شتی دووبارە دروست دەکەنەوە، لەسەر بنەمای هەموو ئەو تێگەیشتنانە سروشت توانای پێداوین بۆ سەرکردایەتی کردنی جیهان و فەرمانڕەواییکردنی نەتەوەییەکان، وەڵێ کاتێك – ئەو کاتە دێت فەرمانڕەوایی جیهان بکەین، ئەو ساتە سودی فەرمانڕواییکردنمان روون دەبێتەوە، هەموو یاساکانی رابردوو هەڵدەگرین، هەموو یاساکانی ئێمە "کورت و روون و پوختن"، پێویستیان بە تەفسیر کردن نییە، بە شێوەیەك هەموو مرۆڤێك دەتوانێت

لە لایەنی ناخەکی و دیاردەییان تێبگات، خاسیەتێکی(Future) سەرەکی یاساکانمان بریتییە لە ملکەچبوونی رەها بۆ دەسەڵات، ئەو بایەخەی بە دەسەڵات دەدرێت، بەرزدەبێتەوە بۆ لوتکەیەکی زۆر باڵا، هاوکات هەموو شێوازەکانی بەخراپ بەکارهێنانی دەسەڵات دەوەستێت، لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێك بەرپرسە لەبەردەم یەك دەسەڵاتی باڵا، یان لەبەردەم دەسەڵاتی فەرمانڕەوای باڵادا، بەکارهێنانی دەسەڵات بەخراپ لەلایەن خەڵك، بێجگە لە فەرمانڕەوا، سزاکەی بە ئاستێکی زۆر دژوارە دەبێت، لەبەر ئەوە هەموو خەڵك ئارەزووی ئەزموون کردنی دەسەڵات لە دەزگاکانی دەوڵەت لەدەستدەدەن.

١٢- بە وردی چاودێری هەموو ئەو هەنگاوانە دەکەین، دەزگا کاگێڕییەکانمان پەیڕەویان دەکەن، هاوکات ئەو ئامێرانەی دەوڵەت لە کارکردن پشتیان پێدەبەستێت، لەبەر ئەوەی کاتێك یەکە کارگێڕییەکان بە سستی بەرێوەدەچن، ئاژاوە لە هەموو شوێنێك بڵاودەبێتەوە، بەڵام هیچ کارێکی نا یاسایی بەبێ سزا تێناپەرێت، هەروەها هەموو خراپ بەکارهێنانێکی دەسەڵات بەبێ سزا تێناپەڕێت.

هەموو کارێکی نەشاو و ناتەواوی بە مەبەست لەلای فەرمانبەران لە بەرێوەبردندا نامێنێت، دوای ئەوەی یەکەم نموونەی سزادان دەبینن، مەزنی دەسەڵاتمان لەوەدایە، پابەندە بە واژۆکردنی سزای گونجاو، یان پابەندە بە واژۆکردنی ئەو سزا دژوارانە(Harsh) لە کاتی هەبوونی کەمترین سەرپێچی لە دەستدرێژی کردنە سەر شکۆی دەسەڵاتمان لە

پێناوی بەرژەوەندی خودی خۆی بۆ دەستدرێژکەر یان هەر کەسێکی دیکەی سەرپێچیکار.

ئەو پیاوەی لەبەر هەڵەکەی بە دژوارییەکی باڵا سزادەدرێت، ئەو سزادراوە سەربازێکە لە گۆڕەپانی(Battlefield) کارگێڕی لە پێناوی دەستەڵات و پرنسیپ و یاسا دەمرێت، هەرچەندە رێگا بە هیچ لادانێك نادەین، لە رێگای راستی جیهان(Public path) لە پێناوی بەرژەوەندی خودی خۆی لابدات، ئەگەر لادان لەو کەسانە روویدا کە هەڵگر و سەرکردەی گەل (Public chariot) بن، بۆ نموونە، دادوەرەکانمان بە یاسا لێبوردن دەردەکەن، ئەوە دەستدرێژی دەکەنە سەر یاسای دادوەری، ئەو دادوەرە دانراوە بۆ واژۆکردنی سزا بەسەر ئەو پیاوانەی شایەنی سزادانن لەسەر تاوانەکەی کردوویەتی، دادوەر بۆ ئەوە دانەنراوە تاکو بتوانێت خەونی خۆی بخاتەڕوو، کەواتە یاسا بڕیاردەدات نەك دادوەر، ئەرکی دادوەر واژۆکردنی جۆری سزایە بەپێی دەقی یاسا دانراوەکان. تایبەتمەندی لێبوردەیی یەکێکە لە سیما چاکەکانی مرۆڤ، لێبوردەیی تەنها دەبێت لە ژیانی تایبەتی مرۆڤ هەبێت، کەواتە لە توانای دادوەری فەرمیدا نییە لە تاوانبار ببورێت، کە کاردەکاتە سەر هەموو بنەمایەکی پەروەردەیی و کاریگەری لەسەر جۆری مرۆڤایەتی دەبێت.

١٤- ئەندامانی یاسایی دوای تەمەنی (٥٥)ساڵی لە دادگاکان خزمەت ناکەن، لەبەر ئەم دوو هۆکارە:

یەکەم: پیرەکان زۆر پێداگر و رەقن لە پەیوەست بوون بە و ئایدیایانەی کە پێشتر درکیان کردووە، کەمترین توانایان بۆ پەیڕەو کردنی سیستەمی نویّ هەیە.

دووەم: هاوشێوەی ئەو رێکارانە یارمەتیمان دەدات بۆ گۆڕانکاریکردن لە چەند دەستەیەك (Staff)، لەبەر ئەوەی کەوتوونەتە ژێر هەر گوشارێك لەلایەن ئێمەوە، کەواتە هەر مرۆڤێك ئارەزوو دەکات پۆستەکەی خۆی بپارێزێت، پێویستە لەسەری دەستەبەری ملکەچبوونی کوێرانە بۆ ئێمە بکات.

بە گشتی دادوەرەکانمان لە نێوان ئەو پیاوانە هەڵدەبژێرین، تێدەگەن ئەرکیان سزادان و جێبەجێکردنی یاسایە، بە پێچەوانە ئەوانەی نقوم بوون لە خەون ئەندێشەی ئازادیخوازی، سیستەمی پەروەردە بۆ حکومەت بەلاڕێدەبەن، وەکو چۆن دادوەرە نەتەوەییەکانی ئێستا پەیڕەوەی دادەوەری دەکەن.

هەروەها سیستەمی گۆڕینی فەرمانبەران یارمەتیمان دەدات لە تێکشکاندن و لەناوبردنی هەر جۆرە یەکگرتنێك، کە فەرمانبەرەکان دەتوانن لە نێوان خۆیان پێکیبهێنن، بۆ ئەوەی تەنها لە بەرژەوەندی حکومەت کاربکەن، کە چانس و چارەنووسیان لەسەر کارەکانیانە، لە رێگای فێرکردن نەوەیەکی پێگەیشتوو لە دادوەران پێدەگەن، ئەو نەوەیە رێگری لە هەموو کارێکی خراپ دەکەن، کە زیان بە پەیوەندی نێوان هاوڵاتیانمان لەگەڵ یەکدی بگەیەنێت.

١٥- بەڵام دادوەرانی نەتەوییەکان لە سەردەمی ئێستادا کارئاسانی لەگەڵ هەموو جۆرە تاوانبارێك دەکەن، بە شێوەیەك لە ئەرکەکانیاندا خاوەنی ئایدیایەکی ڕاست و دروست نینە، لەبەر هۆکارێکی سادە: فەرمانڕەوایان کاتێك دادوەرەکان دادەمەزرێنن، جەختیان لەسەر ناکەن، تاکو لەو ئایدیایە تێبگەن کە لەسەریان ئەرکە و پێویستە جێبەجێی بکەن.

فەرمانڕەوای نەتەوییەکان، کاتێك یەکێك لە هاوڵاتییەکانیان بۆ پرسێکی هەستیار کاندید دەکەن، خۆیان زۆر ماندوو ناکەن، بۆ ئەوەی هەستیاری ئەو پۆستەیان بۆ روون بکەنەوە، تاکو بزانێت ئەو پۆستە بۆ چی دروستکراوە، نەتەوەییەکان وەکو ئاژەڵ کاردەکەن، کاتێك بوێرییە سادەکانیان دەبزوێت، بەهۆی حەزی ئاژەڵی و دڕندانەیان ئەوە دەکەن کە ئارەزوویان لێیەتی، بەو شێوەیە حکومەتی نەتەوەییەکان لەسەر دەستی ئەو کەسانە دەکەون و کۆتاییاندێت، کە دۆخەکان بەڕێوەدەبەن.

١٦- ئێمە یەك ڕێبازی ئەدەبی گەورە وەردەگرین، لە ئەنجامی ئەو سیستەمە هەڵهێنجرابێت نەتەوەییەکان بیناسن، ئەو ڕێبازە ئەدەبییە بەکاردەهێنین بۆ چاکسازیکردنی حکومەتەکەمان.

١٧- ئارەزووە ئازادیخوازییەکان دەکەینە بنەمای سەرەکی لە هەموو دەزگا باڵاکانی حکومەتەکەمان، بۆ بانگەشەکردنی ئەو پرس و پرۆگرامانەی پەروەردە پشتی پێدەبەستێت، بۆ پەروەردەکردنی ئەوانەی

هاوڵاتی ئێمەن، هاوكات پۆستە باڵاكان بەبێ جیاوازی بۆ ئەو كەسانەیە كە پەروەردەییەكی تایبەتی كارگێڕمان كردوون.

تێبینی ئەگەر فەرمانبەرەكانمان پێش كاتی خانەنشینی لە لیستی خانەنشینان دەربكەین، ئەوە حكومەتەكەمان پەستانێكی زۆری بیمەی دەكەوێتە سەر، وەڵامی من بۆ ئەو پرسە: پێش هەموو شتێك هەوڵدەدەین كاری تایبەت بۆ ئەو فەرمانبەرانەی خانەنشینیان دەكەین بدۆزینەوە، بۆ ئەوەی لەبری پۆستە حكومییەكانیان بە كاری دیكە قەرەبوویان بكەینەوە.

بە شێوەیە دەستدەگرین بەسەر هەموو سەروەتی جیهان: ((هەرگیز لە پێناوی بیمە پاشگەز نابینەوە)).

١٨- حكومەتە (ئۆتۆكراتییەكەمان) توانای هەموو كارێكی هەیە، لەبەر ئەوە هەموو بڕیارێكی وەریدەگرین فرمانی ئێستامانە، بەرانبەر شكۆ و ملكەچبوونی بێ مەرج، هەموو جۆرێكی رق و بێزاری رەتدەكەینەوە، لەسەر هەموو ئامارەیك هێمابێت بۆ لەخۆباییبوون سزایی زۆر توندی كەسی لەخۆبایی دەدەین، تاكو بۆ كەسانی دیكە ببێتە وانەیەكی بەهێز، مافی پێداچوونەوە بە یاساكان هەڵدەوەشێنینەوە.

١٩- تەنها جەخت دەكەینە سەر بەرژەوەندییەكانمان، هۆكاری هەڵوەشاندنەوەی یاساكان هەڵەی دادوەرانە لە بڕیاردان، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان رێگەنەدەین لە نێو خەڵك ئەو بیرۆكەیە یان

تێگەیشتنە گەشەبکات و بڵاوبێتەوە، کە دادوەرەکانمان لەوانەیە لە بڕیاردان هەڵەبکەن.

ئەگەر دادوەرێك بڕیارێکی دەرکرد، پێویستبوو پێیدابچینەوە، دبێت ئەو دادوەرەی بڕیارەکەی دەرکردووە، ڕاستەوخۆ دووریبخەینەوە، هەروەها بە ئاشکرا سزای بدەین، بۆ ئەوەی لە داهاتوودا هەڵەی ئاوا دووبارە نەبێتەوە.

ئەوەی گووتم دووبارەی دەکەمەوە، یەکێك لە پرنسیپە سەرەکییەکانمان چاودێری کردنی فەرمانبەرە کارگێڕییەکانە، بە تایبەتی بۆ ئەوەی گەل لەخۆمان ڕازی بکەین، چونکە گەلی ئێمە مافی تەواوی هەیە، پێداگری بکات لەسەر ئەوەی پێویستە حکومەت فەرمانبەری کارگێڕی چاك و دەستپاکی هەبێت.

٢٠- حکومەتەکەمان بە سیما و ڕوخساری متمانە پێکراوی باوکانە(Patriarchal)ی لە کەسایەتی پاشا دەردەکەوێت، گەلەکەمان و هاوڵاتیانمان لە سەرووی باوك پشتی پێدەبەستن، چونکە حکومەتەکەمان هەموو پێداویستییەکانیان دابین دەکات، بە گرنگی هەموو کارەکانیا ڕادەپەڕێنێت، هەروەها هەموو کاروبارەکانی ڕۆژانەی هاوڵاتییەکانی لەگەڵ یەکدی ڕێکدەخات، هەروەها کاروبارەکانی ڕۆژانەیان لەگەڵ حکومەت ڕێکدەخات، بەو پێیە هەستکردن بە کەسایەتی و جووامێری پاشا بە قوڵی لەلای گەل دەچەسپێت، بە شێوەیەك گەل هەستدەکات ناتوانێت بەبێ چاودێری و ئاراستەکردنی

پاشا بەرەوپێش بچێت، بەوپێیە گەل بەبێ پاشا ناتوانێت لە ئارامی و ئاشتیدا بژی، لە کۆتاییدا دەگەن بەو هەقیقەتەی پاشا فەرمانڕەوای (ئۆتۆکراتی) رەهایە.

ئەو هەستە قوڵەی بەرانبەر پاشا لەلای خەڵك دەچەسپێت، نزیك دەبێتەوە لە پەرستنی پاشا، بە تایبەتی کاتێك باوەڕدەکەن فەرمانبەرەکانی حکومەت، فەرمانەکانی پاشا کوێرانە جێبەجێ دەکەن، بەو واتایەی تەنها پاشا دەسەڵاتی بەسەر هەموو فەرمانبەرەکانی حکومەتدا هەیە، خەڵکی دەبینن پاشا ژیانیان(our lives) رێکدەخات، وەکو چۆن باوکان سوورن لەسەر پەروەردە کردنی منداڵەکانیان بە هەستێکی ناسك و جووان، هاوکات وەکو چۆن باوکان پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بە ئەرك و ملکەچبوونی تەواو جێبەجێ دەکەن. لە دیدیگای سیاسەتی نهێنی ئێمەدا ((هەموو گەلێك منداڵە، هەروەها حکومەتی گەلان منداڵن)).

٢١- ئێوە دەتوانن ببینن ستەمکردن لەسەر راستی هەقیقەتە، هەروەها ستەمکردن لەسەر ئەرك دادەمەزرێنم، چونکە مافی حکومەتە پێداگری بکات لەسەر ئەوەی خەڵك ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن، پێداگری کردنی ئەرکە لەسەر فەرمانڕەوا، چونکە فەرمانڕەوا باوکی هاوڵاتییەکانەیەتی، مافی دەسەڵات، بە پاشا دراوە، لەبەر ئەوەی پاشا مرۆڤایەتی بەو ئاراستەیە بەرێوەدەبات کە مافی سروشتی دیاری کردووە، یان بە ئاراستەی ملکەچبوون.

هەموو بوونەوەرێك لەم جیهانەدا ملكەچی دەستەڵاتە، وەلێ دەستەڵاتی مرۆڤ دەستەڵاتی بارودۆخ نییە، یان دەستەڵاتی سروشتی تایبەتی خودی مرۆڤ نییە، ئەگەر بارودۆخەكە یان زەمینەكە هەر چونێك بێت، دەستەڵات پرسێكی مەزنە.

٢٢- بەڵام هێز لە دەستەڵات مەزنترە، كەواتە ئێمە دەبێت شتێك بین، گەورەترین هێزمان هەبێت، لە پێناوی كێشە گشتییەكەمان. هەروەها پێویستە بەبێ پەشیمان بوونەوە قوربانی بە نموونەی ئەو تاكانە بدەین، كە دەستدرێژی دەكەنە سەر سیستەمی فەرمانڕەواییمان، لە تۆڵەی دەستدرێژیكردنیان سزایان بدەین، چونكە چارەسەر كردنی كێشەی گەورەی پەروەردە لە سزادانی راست و نموونەییدایە.

٢٣- ئەو رۆژەی پاشای ئیسرائیل ئەو تاجە دەخاتە سەر – سەرە پیرۆزەكەی، ئەو تاجەی كۆی ئەوروپاییەكان پێیان بەخشیوە، دەبێت بە گەورە پاپا یان پەترياركی(Patriarch)ی هەموو جیهان، ژمارەی ئەو قوربانیانەی پاشاكەمان بۆ چەسپاندنی یاساكانمان ناچارە بیانكات بە قوربانی، لە ژمارەی ئەو قوربانییانە زیاتر نییە، كە پاشایانی نەتەوەییەكان لە كێبڕكێیان لەگەڵ یەكدی كردویانن بە قوربانی گەورەبوونیان بەسەر یەكدیدا، واتە پاشای نەتەوەییەكانی ناجوو بۆ گەورەبوون و سەروەربوونیان بەسەر یەكدی خەڵكانێكی زۆر زیاتریان لە پاشاكەی ئێمە كردووە بە قوربانی.

٢٤- پاشاکەمان پەیوەندی بەهێز و تۆکمەی لەگەڵ خەڵك هەیە، لەسەر مینبەرەکان (Tribunes) وتار پێشکەش دەکات، هەموو وتارەکانی ڕاستەوخۆ و بەخێرایی بە جیهاندا بڵاودەکرێتەوە.

# پرۆتۆکۆلی شازدە:

## شوشتنەوەی مێشك:

## :(Brainwashing )

١- ئارەزووی لەناوبردنی هەموو جۆرە پرۆژەیەکی ڕێکخراو، تەنها پرۆژەکانی خۆمان نەبێت، لە قۆناغی دەستپێکدا کاری ڕێکخراوەکان دەگۆڕین[1]، یان زانکۆکان دەگۆڕین، دووبارە بەپێی پلانی تایبەتی خۆمان بونیادیان دەنێینەوە.

هەروەها سەرۆکی زانکۆکان و مامۆستا دیاریکراوەکان، لە ڕێگای ئامراز و پرۆگرامی کاری نهێنی بڕواپێکراو، بەپێی مەبەستەکانمان بە تایبەتی ئامادە دەکەین و ڕێکیاندەخەین، هیچ مامۆستایەك بەبێ سزا ناتوانێت لە پرۆگرامەکانمان لابدات، بەوشێوەیە لە پێگەیەکی باڵای چاودێریدا دەیانپاڵێوین، سەرۆك و مامۆستا پاڵێوراوە ئامادەکراوەکان بە هەموو شێوەیەك پشت بە حکومەت دەبەستن.

٢- لە پرۆگرامی کارمان(Syllabus) خوێندنی هەموو یاسایەکی شارستانی و هاوشێوەکانی هەڵدەگرین، هەروەها هەموو بابەتێکی

---

[1]- واتە لە بری ئەوەی واز لە فێرخوازان بهێنین لە پەیمانگا و زانکۆکان دەربچن و هەڵگری ئایدیا و بیرۆکەیەك بن، گونجاو نەبێت لەگەڵ مەبەستەکانی ئێمە، بەڵکو پرۆگرامێك دادەنێین، تاکو بەو شێوەیە پەیمانگا و زانکۆ تەواو بکەن، وەکو ئێمە مەبەستمانە یان گەرەکمانە.

سیاسی دیکە لە خوێندنی زانکۆکان هەڵدەگرین، بۆ فێربوونی ئەو زانستانە تەنها ژمارەیەکی کەم لە نێوان راهێنراوەکان هەڵدەبژێرین، لەبەر ئەوەی راهێنراوەکان بلیمەتی و کارامەییان جیاوازە، بۆیە ((رێگە بە زانکۆکان نادەین گەنجانێك لە بەهاری تەمەنی بۆ جیهان پێبگەیەنن، کە خاوەنی ئایدیا یان بیرۆکەی چاکسازی دەستوری نوێ بن، تاکو چاکسازییەکان بە"کۆمیدیا(comedies) و تراژیدیا (Tragedies) بمێننە، رێگەنادەین بە زانکۆکان، گەنجانێك پێبگەیەنن بە خودی خۆیان گرنگی بە پرسی سیاسی بدەن، لەکاتێکدا ئەو گەنجانە ناتوانن لە سیاسەت تێبگەن، ئەگەر باوکیان تێیاننەگەیەنن)).

٣- تێگەیشتن لە سیاسەت بە هەڵە، سەرچاوەی ئایدیای یۆتۆپیایە(Utopian ideas)، ئەمە وادەکات ژمارەیەك لە هاوڵاتیان خراپ و بەدڕەوشت بن، ئێوە دەتوانن بە هەڵەتێگەیشن و خراپی و بەدڕەوشتی خەڵك و هاوڵاتیان بە خودی خۆتان لە سیستەمی پەروەردەی نەتەوەییەکانی دیکەی (نا جوو) ببینن، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان هەموو ئەو پرنسیپانە بخەینە ناو سیستەمی پەروەردە، بۆ ئەوەی بتوانین بە سەرکەوتوویی بونیادی کۆمەڵایەتیان هەڵبوەشێنینەوە و لەناو ببەین، وەکو چۆن لەناومان بردووە و تێکمانشکاندوون، کاتێك دەستدەگرین بەسەر دەستەڵات، هەموو ئەو بابەتانە لە پرۆگرامی پەروەردە دوور دەخەینەوە، کە دەتوانێت ئەقڵیی گەنجان

هەڵبگێڕێتەوە(upset)، بەو پرۆگرامانە گەنجانێکی گوێڕایەڵ پێدەگەیەنین، فەرمانڕەواكانیان خۆش بوێت، لە كەسایەتی ئەو گەنجانە پاڵشتی سەرەکی بۆ ئاشتی و بەرژەوەندی گشتی دیاردەدات.

٤- ڕوودەکەینە لێکۆڵینەوەی کێشەکانی داهاتوو لەبری کێشە کلاسیکییەکان(Classics)، هەروەها گرنگی بە لێکۆڵینەوەی مێژووی کۆن دەدەین، لێکۆڵینەوە لە مێژووی کۆن زیاتر ئەزموونە خراپەکان لەخۆ دەگرێت، لەبری ئەزموونە چاکەکان، هاوکات ئەو تێگەیشتنەی ئاخنراپە یادەوەری مرۆڤی سەدەکانی رابردوو، کە سەردەمانێکی خراپ و نەفرەتی بوو، هیچ تەوەرێك جێناهێلین، تەنها ئەو راستیانە نەبێت، کە هەڵەی حکومەتەکان بە رەنگێکی قێزەون و بێزراو دەخەنەڕوو.

لە پێشەکی پرۆگرامی پەروەردەییمان، بابەت گەلێك هەیە، پەیوەستە بە کێشەی ژیانی پراکتیکی و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و رەفتاری هەموو مرۆڤێك لەگەڵ ئەوانی دیکە، هەروەها لە پێشەکی پرۆگرامی پەروەردەییمان وتار گەلێك هەیە، هێرش دەکەنە سەر نموونەکانی خۆپەرستی خراپ، کە دستدرێژی و هۆکاری شەڕانگێزی دەخەنەوە، هەروەها وتارەکانی هێرش دەکەنە سەر هەموو ئەو پرسانەی هاوشێوەی پرسە شەڕانگێزییەکانن، هاوکات پرسی زگماکین لە مرۆڤدا.

٥- ئەو پرۆگرامەی پەروەردە بە تایبەتی پەیوەستە بە چین و گرووپە جیاوازەکان، فێر کردنی چین و گرووپەکان بە دابڕاوی لە یەکدی

دەمێنەوە، واتە هەموو "چین و دەستە و گروپێك" بە جیاواز لە یەکدی لە رێگای پرۆگرامی پەروەردەیی جیاواز فێردەکرێن.

فێرکردنی "چین و دەستە و گروپەکان" بە رێگای پرۆگرامی جیاوازی پەروەردەیی، گەورەترین مەترسییە بۆ پێداگریکردن لەسەر پێشنەکەوتنی خودی سیستەمی پەروەردەی نەتەوەییەکان، ئەو شێوازەی پەروەردەکردن بەسەر هەموو "چین و گروپەکان"دا دەسەپێنین، بە دابڕاوی و بەپێی پێگە و کاری تایبەتی خۆیان فێریان دەکەین، وەلێ بلیمەتەکانیان بەرێکەوت(chance) پێگەیشتوون، بە بەردەوامی دەزانن چۆن بۆ چینێکی بالاتر بپەڕێنەوە، لەبەر ئەو بلیمەتانەی بە رێکەوت یان چانس پێگەیشتوون، بە رەهایی نەگونجاوە چینە جیاوازەکان تێکەڵ یەکدی بکرێن، هەروەها رێگە نادەین ئەو بلیمەتانە بۆ پلەیەکی بالا بپەڕنەوە، نەك لەبەر ئەوەی دەتوانن پێگەیەك داگیر بکەن، کە بۆ ئەوە لەدایکبوون تاکو ئەو پێگەیە پڕبکەنەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئێوە بە خودی خۆتان دەزانن، چۆن ئەو پرسە لەسەر نەتەوەییەکانە شومە یان نەفرەتە، ئەگەر روویان کردە ئایدیایەکی قوڵ و رەهای یەکلاکەرەوە، بەبێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان چینە کۆمەڵایەتییەکان بکەن.

٦- بۆ ئەوەی پاشاکەمان لە دڵی هاوڵاتییان بە پێگەی جێگیری خۆی بگات، لە ماوەی فەرمانڕەواییکردنیدا ئەوەی گەل لە خوێندنگا یان شوێنە گشتییەکان فێریان بووە لە ناویان دەبات، هەروەها گرنگی

چالاکییەکانی فێربوون و سودی پرۆژەکانیان لەناودەبات و تێکدەشکێنێت.

٧- ئێمە هەموو جۆرێکی فێرکردنی تایبەت دەسڕینەوە، لە ڕۆژانی پشودا فێرخوازان و باوکان مافی ئامادەبوونیان لە کۆبوونەوەکانی کۆلێژەکاندا هەیە، ئەگەر کۆلێژەکە بە خۆرایی یان بێبەرانبەر بوو، لە کۆبوونەووەکاندا مامۆستاکان باسی چەندین پرس دەکەن، وەکو ئەوەی وتاری ئازاد پێشکەش بکەن، لەسەر پرسەکانی رەفتار کردنی خەڵك لەگەڵ یەکدی، هەروەها لەسەر یاسا و هەڵەتێگەیشتن، بە گشتی لە ئەنجامی بۆچوونی هەڵە و ناڕاست بۆ پێگەی کۆمەڵایەتی مرۆڤ وتار پێشکەش دەکەن.

لە کۆتاییدا چەند وانەیەك لە تیۆری فەلسەفەی نوێ پێشکەش دەکرێت، کە هێشتا لە جیهان بڵاونەکراوەتەوە، ئەو تیۆرانە دەبن بە بڕوای ئایینی، نەتەوەییەکان وەکو کۆڵەگەی بڕوا لەسەر راستی بڕوا و ئایینمان وەریدەگرن.

کاتێك ماوەی گەشتکردنتان بە نێو هەموو پرۆگرامەکانمان تەواو دەبێت، بەو گەشتە لە گفتوگۆکردنی هەموو پلانی رابردوو و داهاتوومان تەواو دەبین، ئەو کاتە پلانی تیۆرە فەلسەفییە نوێیەکەمان دەخەمە بەردەستتان.

٨- ئێمە لە ئەزموونی سەدە زۆرەکانی رابردووەوە دەزانین پیاوان دەژین و بە ئایدیا و بیرۆکە رێگەی راست دەگرنەبەر، هەروەها گەل ئەو ئایدیایانە لە رێگای پەروەردە وەردەگرێت، کە پیاوان لە هەموو سەردەمێك بە ئەزموون و ئەنجامی خودی خۆیان پێی گەیشتوون، بەڵام بە ئامرازی جیاواز و پێویست، هەروەها ئێمە بە پەروەردەی سیستەماتیکی چاودێری سەربەخۆی فیکری ماوەی رابردوو دەکەین، ئەو فیکرە یان ئایدیایەی لە سەردەمانی رابردوو ماوەتەوە، بە تەواوی بەکاردەهێنین بۆ مەبەستە تایبەتەکەمان.

ئێمە لە رابردوو سیستەمێکمان دانا بۆ دەستگرتن بەسەر ئەقڵیی خەڵك، بەناوی بەڵگەی سیستەمی پەروەردەیی ( Demonstrative education)[1]، یان سیستەمی (فێرکردنی تیۆری)، لەو سیستەمە سەپاندوومانە ئەو نەتەوەییانەی ناتوانن بە سەربەخۆیی بیربکەنەوە، ئەوە لە رێگای پەروەردەی بەڵگاندن یان تیۆری وەکو ئاژەڵی رامکراو بەڵگەیان لەسەر هەموو ئایدیایەك یان بیرۆکەیەك دەوێت، پێش ئەوەی لەو ئایدیایە یان بیرۆکەیە تێبگەن، یەکێك لە چاکترین نوێنەرەکانمان لە فەڕەنسا بەناوی (بۆرۆی) سیستەمێکی نوێی بۆ پەروەردەی بەڵگەیی یانی تیۆری دانا.

---

[1]- پەروەردەی بەڵگەیی یان تیۆری: واتە فێرخوازان فێری زانستەکان دەکرێن لە رێگای بەڵگەی تیۆری یان گفتوگۆی مزری، گرنگی بە لایەنی پراکتیکی نادرێت.

## پرۆتۆکۆلی حەڤدە:

## خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات:

:(Abuse of Authority)

١- دانپێدانان و ڕەوایەتیدان بە یاساکان لەلایەن دەسەڵات، وادەکات خەڵك دڵڕەق و خوێنسارد و بێبەزەیی و پێداگرین لەسەر لەناوبردنی دەسەڵات، هەروەها خەڵك لە هەموو پرنسیپێك دادەماڵێت، بەو شێوەیە خەڵك واڵێدەکات بە شێوەیەکی نامرۆڤانە بۆ ژیان بڕوانن، لە بەرانبەردا بە شێوەیەکی یاسایی ئەبستراکت دەڕواننە کایەکانی ژیان، ئەو خەڵکانە لەسەر بینینی دیاردەی ڕووداوەکان کاردەکەن، لەو ڕووەی بتوانن بە یاسا پارێزگاری لە خۆیان بکەن، بە پێچەوانە یاساکان بۆ پارێزگاریکردن لە بەختەوەری گشتی نییە.

کاتێك یاسا دانراوەکان دەبێت بە بنەماکانی کار و کایە جیاوازەکانی ژیان، پارێزەرەکان بەرگری لە هەموو پرسێك دەکەن، واتە پارێزەرەکان هیچ پرسێك ڕەتناکەنەوە، بەڵکو ئامادەن بەرگری لە هەموو پرسێك یان کەیسێك بکەن، لە کاتی گرتنەدەستی پرسێك یان کەیسێك پارێزەر بە هەموو توانای خۆی هەوڵدەدات لە ڕێگای پەیوەست بوون بە یاسا دانراوەکان خاڵێك فریوبدەن (Tricky)، لە ڕێگای بچووکی یاسا (Jurisprudence) پاساوەکانی بۆ دادگا دەخاتەڕوو، تاکو بەر گری لە پرسەکە یان کەیسەکە بکات.

لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە سنور و چوارچێوەی کاری ئەو پیشەیە دەبینینەوە، پارێزەرەکان یەکسان دەکەین لەگەڵ فەرمانبەرانی جێبەجێکار و پارێزەرانی هاوشێوەی خۆیان و دادوەرەکان، لەبەر ئەوەی پارێزەران مافی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بریکارەکانیان(clints) نییە، هەروەها مافی وەرگرتنی یاداشتیان لە بریاکارەکانیان نییە، تاکو لەلایەن دادگای یاسایی وەکو پارێزەر دیاری دەکرێن، بەو شێوەیە دوای ئەوەی دادگا لێکۆڵینەوە دەکات، پارێزەران لێکۆڵینەوە لە یاداشتی بریکارەکانیان دەکەن، بەرگریی پارێزەران لە بریکارەکان دوای ئەنجامی لێکۆڵینەوەی دادگا دەبێت، ئەو برە پارەیەی پارێزەران لە کاری پارێزەری وەریدەگرن دیاریکراوە، بە لەبەرچاو گرتنی سەرکەوتنی یان سەرنەکەوتنی لە بەرگریکردندا، بەو واتایەی پارێزەران بڕیاردەری سادەن لە بەرژەوەندی دادپەروەری کاردەکەن، هاوتان لەگەڵ ئەو دادوەرانەی لە بەرژەوەندی دادگا بڕیاردەدەن.

٢- ئێمە جیاواز لە نەتەوەییەکان ڕێکارە یاساییەکان بەو شێوەیە پوخت دەکەین، تاکو لەلایەن خەڵك شایەستەی گرنگیپێدان بێت، لەسەر ئەو بنەمایە یان ئەو ڕێکارانە دەگەین بە بەرگریکردنێکی دوور لە لایەنگریکردن، هەروەها لە بەرگریکردن گرنگی بە لایەنی مادی نادەن، بەڵکو لەسەر کەسەکە پێویستە بڕوا بە پارێزەر بهێنێت یان پارێزەر بە بڕێك پارەی کەم ڕازی بکات، تاکو ببێتە بریکاری، هاوکات بەو ڕێکارانە دەتوانین سنورێك بۆ وەرگرتنی بەرتیل یان گەندەڵی لە دادگاکان دابنێین،

کە لەسەردەمی ئێستادا لە دادگا یاساییەکانی هەندێك دەوڵەتدا هەیە، هەموو ئەو ڕێکارانەی دەیگرینەبەر بۆ بەرزکردنەوەی پێگە و شکۆی دادگایە.

ئێمە لەبەرچاوی خەڵك گرنگی زۆر بە چاودێریکردنی پیاوانی ئایینی(clergy) نەتەوەییەکانی دیکەی (نا جوو) دەدەین، بەو شێوەیە سەرکەوتوو بووینە لە زیانگەیاندن بە پەیامی پیاوانی ئایینی نەتەوەییەکان، وەلێ پیاوانی ئایینی نەتەوەکانی دیکە ئاستەنگ و ڕێگری گەورەنە لە ڕێگەی گەیشتنمان بە مەبەستەکانمان، بەڵام لە ڕێگای چالاکییەکانی ئێمە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لایەنگرانیان کەمدەکاتەوە و پێگەیان لەناو خەڵك لەدەستدەدەن.

٣- لەمڕۆدا ئازادی بیربڕوای ئایینی لە هەموو شوێنێك پەیڕەودەکرێت، ئازادی بیروبڕوای ئایینی درێژەناکێشێت، تەنها چەند ساڵێکی کەم بەردەوام دەبێت، تاکو مەسیحییەت بە تەواوی هەرەسدەهێنێت، دوای ئەوەی مەسیحیەت هەرەسدەهێنێت، پێویستە لەسەرمان بەپێی پێویست لەگەڵ ئایینەکانی دیکە ڕەفتار بکەین، بۆیە لە ئێستادا دانووستان لەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئایینەکانی دیکە ناکەین.

پیاوانی ئایینی توانا مەعریفەکانیان لەسەر یەك لایەنی زۆر بچووکی ژیان کورتدەکەنەوە، کاریگەری خراپ دەکەن سەر خەڵك، بە شێوەیەك ئەو زانست و مەعریفەیەی فێری خەڵکی دەکەن، کاریگەری خراپ و دژی کردوەتە سەر نەریتی خەڵك.

٤- ((ئەو کاتەی - کاتی تێکدانی عەرشی پاپا ( the papal court) دێت، بە تەواوی عەرشی پاپا تێکیدەشکێنین و لەناوی دەبەین، بەدەستێکی نادیار ئاماژە بۆ ڤاتیکان(the vatican) دەکەین، کە ئاماژەن بۆ هێرشکردن، ئەو کاتە خەڵك بە خودی خۆیان لەکاتی هەیەجانی هێرش بردن دەچنە ناو ڤاتیکان، هاوکات ئێمە وەکو پارێزەری ڤاتیکان دەردەکەوین، بۆ ئەوەی قەسابخانەی ناو ڤاتیکان رابگرین، بەو شێوەیە دەگەینە دڵی عەرشی ڤاتیکان، ئەوکاتەی دەگەینە ناو دڵی ڤاتیکان، هیچ هێزێك لەسەر زەوی ناتوانێت دەرمان بکات، تاکو بەتەواوی دەستەڵاتی پاپا تێکنەشکێنین.

٥- دوای ئەوەی دەستەڵاتی پاپا هەڵدەوەشێنینەوە، پاشای ئیسرائیل دەبێت بە پاپای هەقیقی جیهان، واتە دەبێت بە پاتریرکی(Patrich) کەنیسەی نێودەوڵەتی)).

٦- بەڵام هێرش ناکەینە سەر کەنیسەکان، تاکو لە رێگای کەنیسەکان گەنجان فێری بڕوای ئایینی کاتی نوێ بکەین، لە رێگای بڕوای ئایینی تایبەتی خۆمان کە لەنێو گەنجان بڵاوی دەکەینەوە و دەیچەسپێنین، رەخنە لە پاشماوەکانی بڕوای مەسیحی دەگرین، بەو شێوەیە ناکۆکی دەخەینە نێوان بڕوا نوێیە مەسیحییەکەی خۆمان بڵاومان کردووەتەوە، لەگەڵ ئەو بڕوا ئایینیە کۆنەی کە هەبووە.

٧- رۆژنامەکانمان بە کۆی گشتی دەزگا و ناوەندە ئایینیەکانی نەتەوەییەکان ناشرین و قێزەون دەکەن، بەو شێوەیە لە رێگای وتاری

قێزەون و بێزراو دەزگا و ناوەندە ئاینییەکان ئەوەندە ناشرین و قێزەون دەکەین، تاکو ماوەیەکی درێژ تواناکانیان پەکدەخەین، تەنها گەلی جووی دانا یان گەلە دانا کەمان رۆڵی دەبێت.

٨- ((حکومەتەکەمان هاوشێوەی خواوەند ڤیشنو(Vishnu) خواوەندی (هیندی) هەزاران دەستی هەیە، بە هەر دەستێك لە دەستەکانی دەستدەگرێت بەسەر (لەولەبێك)ی دەزگا یان بونیادە کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەت)).

ئێمە بەبێ یارمەتی پۆلیسی فەرمی هەمووشتێك سەبارەت بە گەیشتنی دەزگا و ناوەندە نەتەوەییەکان دەزانین، تاکو چ ئاستێك رووبەڕووی فەسادی و خراپەکاری بووینەوە، هاوکات بە روونی دەزانین ئەوەی هەیە حکومەت نییە، بەڵکو تەنها سەرسامە بە بینینی ئەو هەقیقەتانەی روودەدەن، هاوکات گروپی سێیەم لە گەل ئارەزووی پرۆگرامەکەمان دەکەن، پێویستە ئەو گروپەی گەل بە تایبەتی هەست بە بەرپرسیارێتی و پرنسیپەکانی خزمەتکردنی حکومەتی هەڵبژێردراو بکەن.

ئەو کاتە کاری جاسوسیکردنی نوێنەرەکانمان وەکو کارێکی نابەجێ یان نا جووامێرانە لێی نارواندرێت، بەڵکو بە پێچەوانە کاری جاسوسیکردنی نوێنەرەکانمان وەکو کارێکی شایەستە و جووامێرانە لێی دەڕواندرێت، لە رووییێکی دیکە سزای توندی ئەو نوێنەرانە یان جاسوسانە دەدەین، راپۆرتی هەڵەمان بۆ دەهێنن، تاکو راپۆرت نووس و هەواڵهێنەکان پێگەی خۆیان بەخراپ بەکارنەهێنن.

٩- نوێنەرەكانمان بە یەكسانی لە چینی باڵا و چینی ئاست نزمی كۆمەڵگە هەڵدەبژێرین، هەروەها لە خەڵكانی فەرمانبەر و كارگێڕی ئازاد و ملكەچ و كتێب فرۆش و نووسەر و كرێكار و سواڵكەر و خزمەتكار و هاوشێوەكانیان هەڵدەبژێرین، هەروەها لەو هێزە پۆلیسییەی دەستەڵاتی جێبەجێكردنی سەربەخۆی نییە، هەروەها مافی سزادانی بە ئارەزووی تایبەتی خۆی نییە، كەواتە ئەركی ئەو پۆلیسەی پێگەی گەورە و بەهێزی نییە، ئەركی تەنها بریتییە لە كاری شاهیدیدان، هەروەها پێشكەش كردنی راپۆرت و پشكنین و گەیاندنی ئاگاداركردنەوەكان و رێكخستن و ئامادەكردنی داواكراوان لەسەر دەستی پۆلیسی بەرگری و پۆلیسی شارستانی، ئەگەر كەمتەرخەمبوون لە گەیاندنی راپۆرتەكان و ئاگاداركردنەوەكان یان سەرپێچییەكی پەیوەست بە بارودۆخی سیاسی ئەنجامدا، هاوكات كەسێك بتوانێت سەرپێچییە سیاسییەكەی بسەلمێنێت، ئەو پۆلیسە وەكو تاوانكار دادەنرێت لەسەر تاوانەكەی سزا دەدرێت، لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە یان ئەو رێگایە ئێستا پێویستە برایانمان بەو شێوەیە رەفتار بكەن، بە خودی خۆیان یاسا دابنێن و دەستەڵاتی تابەتمەند ئاگادار بكەنەوە، لە هەموو ئەو كەسانەی بڕوای ئایینی رەتدەكەنەوە، هەروەها دەستەڵات لەو كارانە ئاگادار بكەنەوە كە پێچەوانەی یاسایە، بەو شێوەیە ئەركی هاوڵاتیانمان لە حكومەتە جیهانییەكەمان بریتییە لە خزمەتكردنی فەرمانڕەوایان لەسەر ئەو شێوازەی لە پێشدا خستمانە روو.

١٠- ڕێکخستنێکی جەماوەر بەو شێوەیە هەموو پرس و کارێکی خراپ بە دەستەڵات دەگەیەنێت، هەروەها هەموو جۆرە جیاوازەکانی بەرتیل و گەندەڵی و خراپەکاری بە دەستەڵات دەگەیەنێت، کەواتە هەموو ئەو ئایدیا و بیرۆکانە دادەماڵین، لە ڕێگای تیۆرەکانمان مافی مرۆڤی شارستانی و ژیانی نەتەوەییەکانمان پێ پیس و خراپ کرد.

چۆن توانیمان ئامانجەکانمان لە ڕێگای خوڵقاندنی ئاژاوە لە دەزگا و یەکە کارگێڕییەکانی نەتەوەییەکان بەرجەستە بکەین، تەنها بە بەکارهێنانی نموونەی هەندێك لەو ئامرازانە؟ هاوکات ئامرازی مەزنتر و مەترسیدارترمان بۆ تێکدان و بەلاڕێدابردنی دەزگاکان هەیە، ئەوە نوێنەرانمان کە پێگەیەکی بەرزیان هەیە، سەرپشك دەکەین لە ماوەی چالاکی تێکدەرانەیان کەسانی دیکە لە ناو دەزگاکان گەندەڵ و بەدرەوشت بکەن، بە واتایەکی دیکە بێئەخلاقیان بکەن، نوێنەرە چالاکەکانمان لە ڕێگای ئاوەلاکردن و گەشەپێدانی ئارەزووی تایبەتیان بۆ فەسادی و گەندەڵی، وەکو ئارەزووکردن بۆ خراپ بەکارهێنانی دەستەڵات و ڕووکردنە بەکارهێنانی ڕەشوە، کەسانی دیکەی نزیکیان پیس و خراپ دەکەن.

## پرۆتۆکۆلی هەژدە:

## گرستگیرکردنی نەیارەکان:

## (Arrest of Opponents):

١- کاتێك دەرفەتمان دەبێت یان کاتێك لەلایەن حکومەتی نەتەوەییەکان دەرفەتمان پێدەدرێت رێکاری پۆلیسی تایبەت ئەنجام بدەین یان جێبەجێی بکەین، بۆ ئەوەی تورەیی دەستەڵاتی نەتەوەییەکان بەسەر خەڵکدا بسەپێنین، وەکو تورەیی ئێستای دەستەڵاتی روسیا، تورەیی دەستەڵات توندوتیژترینە، هاوکات مەترسیدارترین ژەهرە لەسەر شکۆی دەوڵەت، ئەو کاتەی ئاژاوە و شلەژان و پێکداپرژان لە نێوان خەڵك دەوروژێنین و بەڕێوەدەبەین، یان نارەزایەتی بێکاری بە یارمەتی وتاربێژە بە تواناکانمان دەوروژێنین، ئەو وتاربێژانە شوێنکەوتە و لایەنگر بۆ نارەزایەتییەکان زیادەکەن، بەو شێوەیە پاساو و بەڵگەی پێویستمان بەدەستەوەدەدەن بۆ ئەوەی ماڵی خەڵك بپشکنین، بارودۆخی ژیانیان بخەینە ژێر کۆتی تایبەت، لە رێگای ئەو کەسانەی کارمان بۆدەکەن لە نێو پۆلیسە نەتەوەییەکاندا.

٢- ئەگەر پیلانگێران پاڵنەری خۆشەویستیان بۆ هونەری پلانگێڕی هەبێت، لە هونەری پیلانگێڕی خۆشەویستییان بۆ سەرکێشی دەبێت، ئێمە پلانگێڕە سەرکێشەکان ناوەستێنین، تاکو دەبینین لە کارەکانیان سەرکەوتوو بوونە، تەنها لە نێوانیاندا چەند ئەندامێکی هەواڵگری تایبەت

بەخۆمان دادەنێن، تاكو قسەكانيان بۆمان بگوازنەوە، پێويستە ئەو راستييە بزانين دەستەڵات هەموو جارێك كە پيلانگێڕى گەلەكەى لە دژى ئاشكرا دەبێت، شكۆى خۆى لەدەست دەدات، هاوشێوەى ئاشكرابوونەكان بە گوێى خەڵك دەچرپێنن، خەڵك پەيى بەبێمتمانەيى دەستەڵات دەبەن، بەڵام لەو حاڵەتە ترسناكتر ئەوەيە، دەستەڵات دان بە هەڵەكانى خۆيدا بنێت، پێويستە ئەو راستييە بزانين ئێمە شكۆى فەرمانڕەوا نەتەوەييەكانمان لەناوبردوە، لە ڕێگاى ئەو ژمارە تيرۆركردنە تاك تاكانەى نوێنەرەكانمان ئەنجامياونداوە، ئەو نوێنەرانە بەرخى مێگەلە كوێرەكەمانن، كە دەتوانين بە سوك و ئاسانى بۆ هەموو تاوانێك فريويان بدەين، تاكو تاوانەكان سروشتێكى سياسيان هەبێت.

٣- ئێمە رقمان لەو فەرمانڕەواييانە دەبێتەوە، دان بە لاوازى خۆياندادەنێن، لەبەر ئەوەى شێوەيەكى راگەيەندراو وەردەگرێت، لە ڕێگاى ڕێكارى پۆليسى تايبەت بە پشكنين و سزادانى ئەوانەى سەركێشن و دژى دەستەڵاتن، شكۆى تايبەتى دەستەڵات دەخەينە نائارامى.

بەڵام پاشاكەمان بە پاسەوانى زۆر نهێنى پارێزراوە، بەو شێوەيە ڕێگە بە هيچ مرۆڤێك نادەين، لە دژى پاشاكەمان يان فەرمانڕەواكەمان رابوەستێتەوە، هەڵبەتە فەرمانڕەواكەمان بە خودى خۆى ناتوانێت پيلانێك بەڕێوەببات، چونكە دەترسيت خودى خۆى لەو پيلانە تيابچێت.

٤- ئەگەر بيستمان فەرمانڕەوا يان پاشاكەمان بە بيرۆكەى پيلانگێڕى هەڵساوە، وەكو لە نێو فەرمانڕەواياننى نەتەوەييەكان باوە، ئەوە ئێمە بە

خودی خۆمان کارتی مردنی پاشاکەمان یان فەرمانڕەواکەمان واژودەکەین، چونکە ئەو جۆرە مردنە تەنها مردنی خودی پاشا نییە، بەڵکو مردنی دەوڵەتەکەیە (Dynasty).

٥- تێبینی ورد لەسەر دیاردەی فەرمانڕەوایی پاشاکەمان(پاشای جوو): دەسەڵاتی خۆی لە بەرژەوەندی گەلی جوو بەکاردەهێنێت، واتە نە بۆ بەرژەوەندی خودی خۆی و نە بۆ بەژەوەندی دەوڵەت بەکارناهێنێت.

لەبەر ئەوەی پاشا پابەندە بەو ئەدەبە یان ئەتەکێتە باڵایە، هاوڵاتیانی ڕێزی دەگرن و بەگەورەی خۆیانی دزانن و گیانی خۆیانی لە پێناودا بەخت دەکەن.

٦- دەسەڵاتی پاشا(Sovereign) بە پیرۆز دادەنێن، چونکە دەزانن بەختەوەری گەل بەستراوەتەوە بەو دەسەڵاتە، چونکە دەسەڵاتی پاشا کۆڵەگەی سیستەمی گشتییە.

دەزگای پاسەوانیکردنی پاشا یەکسانە بە دانپێدان بە لاوازی هێزی پاشا،

٧- بەڵام فەرمانڕەوای ئێمە بەردەوام لە نێو گەلە، واتە فەرمانڕەواکەمان وادەردەکەوێت بە پیاوان و ژنان دەورەدراوە و پارێزراوە، ئەو کەسانە بە ڕێکەوت و بە بەردەوامی لە رووی دیاردەیی لە نزیکی پاشاکەمان کاردەکەن و نزیکن لێی، ئەوانە بە پۆشاك و رووخساری پاسەوانی فەرمانڕەوا دەرناکەون، بەڵکو بە پۆشاکی کارکردن و ئاسایی

دەردەکەون، ئەو پاسەوانە نهێنیانە هاوڵاتییانیان لە پاشا دوور خستووەتەوە، بە پاساوی پاراستنی سیستەم لە پێناوی سیستەم.

هەوڵی دانبەخۆداگرتن، ئەم نموونەیە هەموویان دەیزانن، ئەگەر بینیان کەسێك لە نێو ئاپۆرای خەڵك دەیەوێت نووسراوێکی هەستیار بە پاشا بدات، لە ماوەی نێو ئاپۆرای خەڵك پاڵدەنرێت و ناگات بە پاشا، ئەو کەسانەی لە ریزی یەکەمی نزیکی پاشان نووسراوەکە وەردەگرن، بە ئامادەبوونی خاوەن نووسراوەکە پێشکەشی پاشای دەکەن، بۆ ئەوەی هەموو کەسێك یان هەموو هاوڵاتییەك بزانێت نووسراوە هەستیارەکانی دەگاتە دەستی پاشا، ئەو کاتە مرۆڤەکان وادەست دەکەن کە بەخودی خۆیان هەموو کاروبارەکان بەرێوەدەبەن، بۆ ئەوەی شکۆ و پێگەی دەستەڵات بمێنێتەوە، پێویستە پێگەی دەستەڵات لە رووی متمانە بگات بە ئاستێك، خەڵکی لە نێوان خۆیاندا بڵێن: "ئەگەر پاشا دەیزانی" یان "کاتێك پاشا دەزانێت"[1].

٨- ئەو سۆفییانەی(Myticism) دەوری پاشایان داوە، تەنها بە بینینی پاسەوانی پۆلیس لە دەوری پاشا، خۆیان لە پاشا بەدوور دەگرن

---

[1]- واتە خەڵك دەڵێن: ئەگەر پاشا ئەو زیانەی کە بەسکاڵا بەرزکراوەتەوە دەیزانی ئەو رەزامەند نەدەبوو لەسەری یان سزای ئەو کەسانەی دەدا هۆکاری زیانەکەن، هەروەها هەوڵیدەدا کاریگەرییەکانی زیانەکە لابەرێت، کاتێك پاشا ئەو پرسانە دەزانێت، ئەو کارە دەکات لە دیدی کەسەکە چاکە و بەرژەوەندی ئەوی تیادایە.

یان دەکشێنەدواوە، نموونەی ئەو پاسەوانانە بۆ پاراستنی پاشا لە هیچ جۆرە تیرۆرێك(assassin) نییە، بەڵکو ئەزموونکردنی برێکی دیاریکراوە لە خراپەکانیان، بۆ ئەوەی ئاوا خۆیان پێشان بدەن لە پاسەوانان بەهێزترن، هەروەها توانای خۆیان بەرجەستە دەکەن، لە دوای ئەوەی وەکو پاسەوانی پاشا دەناسرێن و توانای خۆیان بەرجەستە دەکەن، چاوەڕێی ئەو ساتە دەکەن، تاکو بتوانن هەڵسن بە هێرشکردنە سەر ئەو هێزەی پۆلیس کە پاسەوانی پاشان.

ئێمە نەتەوەییەکانی دیکەی نا جوو لەسەر ئەو ڕێبازە ئامۆژگاری ناکەین، ئێوە دەتوانن بە خودی خۆتان ئەنجامەکان ببینن، کە دانانی پاسەوانی ئاشکرا و دیار چ ئەنجامێکی هەبووە.

٩- حکومەتەکەمان ئەو کەسانە دەستگیر دەکات، دەتوانرێت بەچاکی گومانی ئەنجامدانی تاوانی سیاسی زۆر یان کەمیان لێبکرێت، پێدانی دەرفەتی راکردن بە هاوشێوەی ئەو کەسانە پرسێکی ویستراو نییە، لەبەر ئەوەی مەترسی هەڵەکردن لە فەرمانڕەواییان لەسەرە.

ئێمە بە کردەوە سۆز بۆ ئەو جۆرە تاوانکارانە پێشان نادەین، لە هەندێك حالەت یان بارودۆخی دیاریکراودا ئەو کارانە کردەییە، بە تایبەتی کاتێك ڕووبەڕووی حالەت و دۆخێکی شەڵەژاو دەبینەوە، لەگەڵ تاوانی ئاسایی بە ئارامی هەڵسوکەوت دەکەین، بەڵام دەرفەت بە تاوانی سیاسی نادەین و لەگەڵیاندا ئارام و لەسەرخۆنابین و ئاسنکاریان بۆ ناکەین، واتە لەگەڵ ئەو کەسانە ئارام نابین و دەرفەتیان پێنادەین، کە ڕۆچوونەتە نێو

سیاسەت، تەنها پاشا ئەو سیاسەتە دەزانێت، لە هەقیقەتدا نابێت هەموو دادوەرێك توانای تێگەیشتنی سیاسەتی راستییان هەبێت، بەڵکو پێویستە تەنها کەسایەتی پاشا توانای تێگەیشتنی سیاسەتی هەبێت.

## پرۆتۆكۆلی نۆزدە:

## خەڵك و فەرمانڕەوا:

:(Rulers and People)

١- ڕێگری لەو سیاستمەدارانە دەكەین لە سیاسەتكردن بەردەوامن، بەڵام لە ڕوویێكی دیكە هانیاندەدەین بۆ هەموو جۆرە پێشنیارێك یان خستنەڕووی بۆچوونە سیاسییەكانیان، لەبەر ئەوەی تاكو ئێستا لەسەر چاكتركردنی ژیانی كۆمەڵایەتی و نەتەوەیی كاردەكەن و كارەكانیان گونجاوە لەگەڵ كاری حكومەت، لەسەر بنەمای ئەو كارانە هەڵەی حكومەتەكەی خۆمان و نموونەی باڵای ژیانی كۆمەڵایەتی بۆ هاوڵاتییانمان دەزانین، واتە لە چاكسازییەكانی ئەوان هەڵەی حكومەتەكەی خۆمان دەزانین. نموونەی باڵای ژیانی كۆمەڵایەتی بۆ هاوڵاتییانمان هەڵدەبژێرین، وەڵامی پێشنیاری سیاسەتمەدارەكان بە پەسندكردن یان بە پێشكەشكردنی پاساوی بەهێز ڕەتدەكەینەوە، ئەگەر پێشنیارەكانیان ڕازیكەر نەبوو، بۆ ئەوەی بیسەلمێنین نەكردەییە جێبەجێبكرێن، ئەوە پرۆژەیەك بۆ وێناكردنی كورتبینی دۆخ و حاڵەتەكان دەخەینەڕوو.

٢- لە دیدی ئێمە((شۆڕش لە وەڕینی سەگ بە فیل زیاتر نییە))[1]، لە حکومەتی ڕێکخراودا، ڕێکخستنێکی چاك لە ڕووی تێڕوانینی کۆمەڵایەتی هەیە، نەك لەڕووی تێڕوانینی پۆلیسی، سەگ بە فیل دەوەڕێت، بەبێ ئەوەی تواناکانی خۆی بەدەستبهێنێت، لە کاتی وەڕینی سەگ، تەنها لەسەر فیل پێویستە، توانای خۆی وەکو یەکەیەکی بەتوانا بخاتە ڕوو، بۆ ئەوەی سەگ واز لە وەڕین بهێنێت و کلکی خۆی بلەقێنێت[2].

٣- بۆ ئەوەی تاجی ئازایەتی لەسەری تاوانکاری سیاسی بێنینەخوارەوە، دەیخەینە پلەی تاوانبارانی دیکە، بۆ ئەوەی لەگەڵ دز و بکوژ و جۆرەکانی دیکەی شەڕانگێز و بێزراوەکان ئەژمار بکرێت. ئەو کاتە ڕای گشتی بە ئەقڵ دەڕوانێتە تاوانە سیاسییەکان، لەسەر ڕۆشنایی خودی خۆی تاوانی ئاسایی لە سیاسییەکاندا دەبینێت، بەو شێوەیە ڕای گشتی پەنجەی داوێنپیسی و بێئابڕویی و ریسواییان دەخاتە سەر، تاوانە ئاساییەکانیان بەبێ جیاوازی دەداتە پاڵ و پێداگریان لەسەر دەکات.

---

[1]- نموونەی وەڕینی سەگ بە فیل، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەقیقەتەی فیل لەبەر ئەستووری پێستی بە تایبەتی توانای هەستی ئاگایی زۆر لاوازە، بۆ فیل یەکێکە لەو ئاژەڵە دەگمەنانەی بە ئاسانی ناوروژێت، تاکو ئاستێکی زۆر بێئاگایە لەو ڕووداوانەی لە دەوروبەری ڕوودەدەن، لە کاتی بەئاگایشدا گرنگی بەو ئاژەڵە بچووکانەی دەوروبەری خۆی نادات.

[2]- کلك لەقاندنی سەگ: واتە سەگ کلکی خۆی دەلەقێنێت بۆ ئەوەی ملکەچبوونی خۆی نیشان بدات.

٤- هەموو هەوڵێکی خۆمانداوە، بۆ ئەوەی ڕێگری لە نەتەوەییەکان بکەین، تاکو ئەو ڕێبازە شایەستەییە لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ تاوانی سیاسی هەڵنەبژێرن، بۆ ئەوەی بەو مەبەستە بگەین، ڕۆژنامەکانمان و وتاری گشتی و کتێبی مێژوویی و پرۆگرامی خوێندنمان بەکارهێناوە، هەروەها زۆرجار بیرۆکەی کوژراوی سیاسی شەهیدە و نامرێت، ئێمە بە نەتەوەییەکانمان بە خشیوە، پێیاندەڵێین کوژراوی سیاسی لە پێناوی ئایدیای بەختەوەری مرۆڤایەتی دەکوژرێت، لەبەر ئەوە نەمرە و شەهید دەبێت، ئایدیای کوژراوەکان شەهیدن ژمارەی یاخیبووانی دوو ئەوەندەی پێشوو زیاتر کرد، لە ئەنجامی یاخیبوونی نەتەوەییەکان دەرگای نوێنەرانمان بۆ هەزاران لە نەتەوەییەکان کردەوە، واتە بە زۆربوونی ژمارەی یاخیبوونەکان چینی نوێنەرانمان زیاتر و فراوانتر بوو.

## پرۆتۆکۆلی بیست:

## پرۆگرامی دارایی:

## (Financial Programme):

١- ئەمڕۆ لەسەر پرۆگرامی دارایی قسەدەکەم، لە بنەماوە بۆ کۆتایی راپۆرتەکەم دامنابوو، لەبەر ئەوەی پرسی دارایی بەهێزترین پرس و ئامرازی سەردەمە، هاوکات برگەی کۆتایی پلانەکەمانە، بەڵام پێش ئەوەی دانووستان لەسەر ئەو خاڵە بکەم، ئەو خاڵانەو بەیاد دەهێنمەوە کە پێشتر ئاماژەم پێیانکردبوو، لێرەدا دەمەوێت بڵێم سیاسەتی گشتیمان لەسەر داتا و ژمارە وەستاوە.

٢- کاتێك دەگەین بە دەستەڵات حکومەتە ئۆتۆکراتییەکەمان لە پێناوی بەرژەوەندی خۆی، لە سەپاندنی باجی قورس بەسەر هاوڵاتیان دوور دەکەوێتەوە، بەردەوام بەیادی خەڵکی دەهێنینەوە ئەو رۆڵەی پێویستە حکومەت بیگێرێت، رۆڵی پارێزگاریکردنی باوکایەتییە، بەڵام لەبەر ئەوەی سیستەمی حکومەت بەردەوام پێویستی بە برێکی گەورە لە دارایی هەیە، ئەوە پێویستە ئامرازی پێویست بۆ ئامادەکردنی دارایی ئامادە بکەین، بۆیە پێویستە بە پێداگری هەوڵی دۆزینەوەی ئەو ئامرازانە بدەین، لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە وایدەبینین بڕی باجەکان بە فێڵێکی گونجاو لەگەڵ یاسا دابەشبکەین بەسەر قیستی دیاریکراو.

٣- فەرمانڕەواکەمان خاوەنی هەموو سەروەت و موڵکی دەوڵەتە، (ئەو پرسە بە روونی و ئاسانی بابەتی جێبەجێکردنە)، لەبەر ئەوەی حکومەت دەتوانێت توانای دارایی زیاد بکات، ئەو توانایەی بۆ ڕێکخستنی ئاڵوگۆڕی دراو لە وڵاتدا پێویستە.

بەوپێیە سەپاندنی باجی هەڵکشاو لەسەر موڵك چاکترین ئامرازە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خەرجییەکانی حکومەت و دابینکردنیان، لەسەر ئەو بنەمایە باجەکان لە کاتی خۆیان دەدرێن، بەبێ ئەوەی خەڵك بشڵەژێن یان ئیفلاس بکەن، ئەو چەندایەتییەی باج بەسەر هاوڵاتیان دەیسەپێنێت، پەیوەندی بە هەموو موڵکداری تاك هەیە.

پێویستە دەوڵەمەندان بزانن، ئەرکیانە دەستبەرداری بەشێك لە سامانە زیادەکەیان بن بۆ حکومەت، لەبەر ئەوەی حکومەت دەستەبەری موڵکە ماوەکانیان دەکات، هەروەها مافیان پێدەدات بە ئامراز و ڕێگای دەستپاکی (honest) سامان بەدەستبهێنن، من دەڵێم پاك، لەبەر ئەوەی کارگێڕیی موڵکداری لەسەر بنەمای یاسایی ڕێگە بە دزیکردن دەدات.

٤- ئەو چاکسازییە کۆمەڵایەتییە، پێویستە لە پێشەنگی پرۆگرامەکەماندابێت، هاوکات ئەو چاکسازییە دەستەبەری سەرەکی ئاشتییە، بۆیە ناکرێت ئەو چاکسازیانە دوابخرێن.

٥-سەپاندنی باج بەسەر هەژاران بنەمای هەموو سەروەت و سامانێکە، سەپاندنی باج بەسەر هەژاران بەردەوام زیانی گەورە بە حکومەت دەگەیەنێت، لەبەر ئەوەی کاتێك حکومەت هەوڵدەدات باج لەسەر هەژارەکان زیاد بکات، دەرفەتی بەدەستکەوتنی دارایی لە زەنگینەکان لەدەست دەدات.

سەپاندنی باج بەسەر سەرمایەداران زیادبوونی سەروەت و سامان لە دەستی کەسانی تایبەت کەمدەکاتەوە، کە رێگەمانپێدابوون سەروەت و سامان کۆبکەنەوە، تاکو بتوانن بە هاوسەنگی لەتەك حکومەتە نەتەوەییەکان و داراییەکەیان کار بکەن.

٦- باجی هەڵکشاوی سەپێنراو بەسەر پشکی تاك داهاتێکی گەورەتر لە سیستەمی باجی ئێستا کۆردەکاتەوە(١٩٠١)، لە سایەی ئەو باجە هەمو خەڵك لە رووی دارایی پێدەگەن، لە سەردەمی ئێستادا ئەو سیستەمە بۆ ئێمە پێویستە، لەبەر ئەوەی بێزاری و نارەزایی لە نێوان نەتەوەییەکانی دیکەی ناجوو دەروست دەکات[1].

٧- لە بنەماوە ((هێزی پاشاکەمان لەسەر هەقیقەت بونیادنراوە))، بۆیە دەستەبەری هاوسەنگی نێودەوڵەتی و ئاشتی بەردەوامی جیهان دەکات، لەسەر سەمایەداران پێویستە دەستبەرداری سامانەکەیان ببن، تاکو حکومەت چالاکییەکانیان بپارێزێت.

---

[1] - تێبینی ئەم وتارە لە ساڵی (١٩٠١)دا بڵاوکراوەتەوە.

پێوستە ئەو سەرمایەدارانەی دەتوانن خەرجییەکانی حکومەت دابین بکەن، خەرجییەکان بە حکومەت بدەن، هەروەها ئەو سەرمایەدارانەی دەتوانن خەرجییەکان دابین بکەن، دەبێت سەرمایەی زیاتر بدەن.

٨- نموونەی ئەو ڕێکارانە پەیمانێکە لەلایەنی هەژاران بۆ سەر ئەو دەوڵەمەندانەی کە ئامادەن پاڵپشتی دارایی پێویستی حکومەت بکەن، چونکە هەژارەکان دەبینن دەوڵەمەندەکانیان پارێزگاری لە ئاشتی و بەختەوەری گشتی دەکەن، هاوکات چینی هەژار تێدەگەن دەوڵەمەندەکان سەرمایەی خۆیان بۆ ئامرازەکانی ئامادەکردنی سودی کۆمەڵایەتی خەرج دەکەن.

٩- بەو شێوەیە هەردوو چینی هەژاران و دەوڵەمەندان دەبن بە دوو چینی زیرەك، یان ئەوانەی باج دەدەن زیرەکن، لەکاتی سکالا کردن لە سیستەمی نوێی باج، هەردوو چین بە ڕوونی لە ڕێگای خەرجکردنی سامانەکەیان دیاری دەکەن، بەڵام ئەو لایەنەی سامانی پێویست بۆ پێداویستییە تایبەتەکانی پاشا و پێداویستییە کارگێڕییەکان خەرج دەکات جیادەکرێتەوە.

١٠- بەو پێیە ((پاشا موڵکی تایبەت بە خودی خۆی نییە، هەموو شتێکی دەوڵەت موڵکی پاشایە، ئەگەر ڕێگە بە پاشا درا موڵکی تایبەت بە خۆی هەبێت، ئەو کاتە وادەردەکەوێت هەموو موڵکی دەوڵەت موڵکی پاشا نییە)).

١١- سەبارەت بە کەسە نزیکەکانی پاشا یان خزمانی پاشا، حکومەت تەنها خەرجی میراتگرەکانی پاشا دەگرێتە ئەستۆی خۆی، هاوکات پێویستە هەموو میراتگرەوەکانی پاشا فەرمانبەری حکومەت بن، یان کارێکی دیکە بکەن بۆ ئەوەی مافی خاوەندارێتی سەروەت و سامانیان هەبێت، حکومەت هیچ ئامادەکارییەك یان ئاسانکارییەکیان بۆ ناکات، بە پاساوی ئەوەی لە خوێنی پاشان، تاکو بە مشەخۆری لەسەر خەرجی دەوڵەت بژین.

١٢- لێرەدا باجی مۆرکراوی هەڵکشاو لەسەر فرۆشتن و کڕین هەیە، هاوشێوەی باجی ڕێژەیی(death duties)، هەڵبەتە گواستنەوەی موڵك بەبێ مۆری پێویست بە نایاسایی دادەنرێت، ئەو کات خاوەنەکەی پێشویی(former) ناچار دەکرێت لە مێژووی فرۆشتنی باج بە ڕێژەی سەدی (percentage) لەسەر باجەکە بدات.

پێویستە بەڵگەکانی گواستنەوەی موڵك هەفتانە بە چاودێرانی باجی خۆجێیی(local) بدرێت، بەڵگەکان ناو و نازناوی (surname) هەردوو خاوەن موڵکی نوێ و کۆن لەخۆ دەگرێت، ناونیشانی هەردووکیان جێگیرە یان نەگۆڕە، هاوشێوەی ئەو جۆرە ڕێکارانە لە پێناوی سەودای دارایی پێویستە، بەو ڕێکارانە سەودا داراییەکان بە بڕێکی دیاریکراو زیاد دەکەن، مەبەستم ئەوەیە کاتێك بڕی سەودا داراییەکان زیاد دەکەن، یەکسان دەبن لەگەڵ ناوەندی خەرجییە پێویستە سەرەتاییەکانی (surname) ڕۆژانە، هەروەها پێویستە کەلوپەلەکان بە

مۆرکراوی(stamed) و بە مۆری باجی دیاریکراوی ئاسایی بفرۆشرێن.

١٣- ئەوەندە بەسە ئێوە بزانن بڕی ئەو باجەی هەژماری دەکەن دوو ئەوەندە لەسەر داهاتی حکومەتە نەتەوەییەکانی دیکەی نا جوو زیاد دەکات.

١٤- بێگومان پێویستە دەوڵەت بڕێکی دیاریکراو لە سەرمایە وەکو یەدەگ هەڵبگرێت، ئەگەر داهات لەسەر باج وەرگرتن لەو بڕە دیاریکراوە زیادی کرد، ئەوە داهاتە زیادەکە دەگێڕینەوە بۆ ئاڵوگۆڕی دارایی، هاوکات ئەو بڕە زیادەیەی لەبەردەستدایە، خەرجی دەکەین بۆ رێکخستنی هەموو جۆرە کارێکی گشتی.

ئەو کارانەی رێکیاندەخەین ئاراستەی دەزگاکانی حکومەتیان دەکەین، بەو کارانە بەرژەوەندی چینە پەیوەستەکان بە تۆکمەی بە بەرژەوەندییەکانی حکومەت و بەرژەوەندی موڵکەکانیان دەبەستینەوە، هەروەها بەشێك لە داراییە بەدەستهاتووەکە وەکو پاداشت بۆ داهێنان و وەبەرهێنان خەرج دەکەین.

١٥- هەر کەسێك پابەند بوو بە پێداویستییەکان و گوێی بە دراو نەدا، واتە دراوی بەبێ چالاکی لە بانکی دەوڵەت دانا و بڕی دراوەکەی لە بڕی دیاریکراو تێپەڕی، لەوانەیە بۆ مەبەستێکی تایبەت بێت، ئەگەر بینیمان ئەو دراوە بۆ ئاڵوگۆڕییە، ئەوە هەر کەڵەکبوونێکی دارایی کاریگەری زیندو

و بەردەوام دەکاتە سەر کاروبارەکانی دەوڵەت، چونکە سەروەت و سامان وەکو کاری ڕۆن(زیت) کار لە دەزگاکانی دەوڵەت دەکات، ئەگەر ڕۆن بوو بە ئاستەنگ، ئەوە کاری دەزگاکانی دەوڵەت دەوەستێت.

١٦- ئەگەر وا ڕێکەوت کۆمپیاڵە بانکییەکان گۆڕدرانەوە بە بەشێکی گەورە لە دارایی، ئەو کاتە وەکو روونمان کردەوە بە تەواوی هەڵاوسانی هاوشێوە دروست دەکات، ئەنجامی دروستبوونی ئەو هەڵاوسانە زۆر روونە، واتە لە ئەنجامی گۆڕینەوەی کۆمپیالەکان دروست بووە.

١٧- لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە دەستەیەك بۆ ژمێریاری پێکدەهێنین، بۆ ئەوەی پاشا بتوانێت لە هەموو کاتێکدا چاوی بە ژمێرەی تەواوی خەرجی و داهاتەکانی حکومەت بکەوێت، ئەو دەستەیە هەموو ڕاپۆرتەکان بە وردی و لەخۆبوردوویی تاکو مێژووی هەژمارکردن دەپارێزن، تەنها (کەینەکان) ڕاپۆرتەکانی مانگی داهاتوو و پێشوو لەخۆناگرێت، بەڵکو هەموو ڕاپۆرتەکان لەخۆ دەگرێت.

١٨- تەنها یەك تاکەکەس بەرژەوەندی لە دزینی بانکی دەوڵەتدا نییە، ئەو کەسە خاوەنی بانکی دەوڵەتە، مەبەستم پاشایە، لەبەر ئەو هۆکارە کۆنترۆڵی هەموو شیمانەکانی زیاد خەرجکردن یان خەرجی نا پێویست دەکات، چاوپێکەوتنەکانی پاشا بە ئەتەکێت و پلان بەرێوەدەچێت، لەبەر ئەوەی چاوپێکەوتنەکان کاتی بەنرخی پاشا بەفیرۆدەدەن.

١٩- کەواتە چاوپێکەوتنی پاشا دەگمەنە یان نییە، بۆ ئەوەی دەرفەتی گەورەی بۆ ڕوانین و سەیرکردنی کاروبارەکانی دەوڵەت هەبێت، پێویستە پاشاکەمان بە حەشیمەتی خزمەتکار و سەماکاری گەمژاندن دەورەنەدرابێت، چونکە ئەو پاشایانەی بە حەشیمەتی خزمەتکار و سەماکار دەورەدراون، تەنها گرنگی بە کاروباری تایبەتی خۆیان دەدەن، کاری چاودێری و بەختەوەری دەوڵەتیان خستووەتە لاوە و فەرامۆشیان کردووە[1].

٢٠- ئەو قەیرانە ئابوورییانەی بە سەرکەوتوویی لە وڵاتانی نەتەوەییەکانی نا جوو بەڕێوەمان بردووە، لە ڕێگای کێشانەوەی دارایی و ئاڵوگۆڕی دارایی ئەنجاممانداوە، دوای ئەوەی سەروەت و سامانێکی زۆر کەڵەکەبوو، پارەمان لە حکومەت کێشایەوە، حکومەتەکان ناچاربوون لەو سەروەت و سامانە کەڵەکەبووە ڕێگاچارەیەك بۆ بڕیاری قەرزکردن

---

[1]- بەداخەوە زۆربەی فەرمانڕەوایان لە نەتەوە دواکەوتووەکان بە حەشیمەت یان خەڵکانی خزمەتکار و سەماکەر دەورەدراون، ئەوانە کەسانی خۆپەرست و هەڵپەرستن تەنها گرنگی بە بەژەوەندییەکانی خۆیان دەدەن، حەشیمەتی خزمەتکار و سەماکەر وەکو سەگی ڕاوکردنن گرنگی بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان نادەن، بەڵکو تەنها کاردەکەن بۆ ڕازیکردنی گەورەکانیان، ئەوانە نەتوانای داهێنانیان و نە توانای سیاسیان هەیە، هەروەها دڵسۆزی بەرژەوەندی گشتی و بەژەوەندی هەقیقی گەورەکەیان نینە، کە بەرژەوەندی گەورەکەیان بەستراوەتەوە بە بەرژەوەندی گەلەکەیان.

بدۆزنەوە، ئەو قەرزانە بارێکی گرانییان خستە سەر حکومەت، قەرزەکان حکومەتیان ناچارکرد بەدەستی خۆیان سوی زۆری دارایی قەرزە کەلەکەبووەکان بدەن.

ئەگەر بەرهەمی وڵات لە دەستی سەرمایەدار کۆبووەوە:((سەرمایەدار هێزی خەڵك بۆ بەرهەمهێنان دەمژێت، بەوشێوەیە هێزی خەڵك وشك دەکات، بەوپێیە سەرمایەدار لەگەڵ مژینی هێزی خەڵك، سەروەت و سامانی دەوڵەت دەمژێت)).

٢١- لە سەردەمی ئێستادا دارایی ئاڵوگۆڕی ناتوانێت پێداویستییەکانی چینی کرێکاران پڕبکاتەوە، واتە بەس نییە بۆ پڕکردنەوەی داواکارییەکان و ڕازیکردنی هەمووان.

پێویستە دەرکردنی دراو یەکسان بێت بە گەشەی دانیشتوان، پێویستە منداڵان لە ڕۆژی لەدایکبوونیان بە بەکاربەری دراو دابنرێن، هەژمارکردن یان پوختەکردنی دراو سات لەدوای سات پرسێکی ژیاری کۆی جیهانە.

٢٢- بە بۆچوونی من ئێوە دەزانن ((دراوی ئاڵتوون شادەماری دەوڵەتە))، هاوکات دەوڵەتی لەسەری بەڕێوەدەچێت، لەبەر ئەوەی ئاڵتوان بەشی داواکاری دانیشتوان ناکات، ئەوە ئێمە لەسەروی ئەو داواکاریانەی خەڵك، کۆتا هەوڵیخۆمانداوە بۆ کەلەکەکردن و ڕاکێشانەوەی ئاڵتوون لە ئاڵوگۆڕکردن.

٢٣- حکومەتی ئێمە دراوێکی هەیە، لەسەر هێزی کارکردن لە وڵاتدا بونیادنراوە، گرنگ نییە ئەو دراوە لەسەر کاغەزە یان لەسەر تەختەیە.

ئێمە دراوی تەواو بە هەموو تاکێك لە هاوڵاتیانمان دەدەین، لە گەڵ لەدایکبوونی هەر منداڵێك ئەو بڕە زیادەیەی دەیدەینە کەسێك بڕەکە کەم دەکەینەوە.

٢٤- لەسەر ژمێرەی حکومەت - ژمێرەی حکومەتە خۆجێییە جیاوازەکان و ژمێرەی نووسینگەی هەرێمەکان دادەنێین.

٢٥- هەر لایەنێك یاری بکات لە پێدانی شایستە دارییەکان بە حکومەت، ئەوە دادوەر بە خودی خۆی فرمان دەردەکات لەسەر ماوەی ئەو بڕە پارەیەی وەکو شایەستەی داریی بە حکومەتی دەدات، بەو شێوەیە خاترگرتن کۆتایی دێت، کە هەندێکجار وەزارەتی دارایی بەرانبەر دەزگایەك یان دەستەیەك یان کۆمپانییایەك دەینوێنێ یان دەریدەبڕێت.

٢٦- هەروەها حکومەت ژمێرەی داهات و خەرجییەکان بە یەکەوە دەپارێزێت، بۆ ئەوەی داهات و خەرجییەکان بە بەردەوامی لەگەڵ یەکدی بەراورد بکات.

٢٧- ئەو پلانەی بۆ چاکسازیکردن لە دەزگای دارایی نەتەوەییەکانی دیکەی نا جوو پەیڕەوی دەکەین، بە شێوەیەك پەیڕەوی دەکەین کە نەتوانن تێبینی بکەن و سودی لێببینن، لێرەدا ئاماژە بە شێوازی ئەو چاکسازییە پێویستەی نەتەوەییەکان دەکەین، کە نەتەوەییەکان لە

حالەتی قەیرانی دارایی پێی گەیشتوون، پێویستیان پێیەتی، هۆکاری یەکەمی ئەو حالەتە خراپەی دارایی لەو هەقیقەتە بەرجەستە دەبێت، حکومەتی نەتەوەییەکان لە سەرەتای ساڵی دارایی دەستدەکەن بە ئامادەکردنی راپۆرتێکی دارایی ڕێژەیی بۆ بودجەی حکومەت، کاتی ئامادەکردنی بودجە زیاترە لە ساڵێك، ساڵێك هۆکارە بۆ ئەمانە: ئامادەکردنی بودجەی ساڵانە حکومەت بەردەوام دوادەکەوێت، تاکو دەگات بە نیوەی ساڵ، ئەو کاتە بودجەیەکی پوختەکراو پێشکەش دەکرێت، خەرجییە گشتییەکان لە ماوەی سێ مانگ خەرج دەکرێت، لەدوای ئەوە دەنگ لەسەر بودجەی ساڵی نوێ دەدرێت، لە کۆتایی ساڵ راپۆرتی ژمێریاریی بۆ پوختەکردنی بودجە ئامادەدەکرێت، بەو شێوەیە بودجەی یەك ساڵ لەسەر کۆی خەرجییە — خەرجکراوەکانی ساڵی رابردوو دادەنرێت، لەسەر ئەو بنەمایە هەموو ساڵێك کورتهێنان بە بڕی (٥٠٪) لە بڕی دارایی بنەڕەتی دەبێت.

بەو شێوەیە لەدوای (١٠) ساڵ بودجەی ساڵانە سێ جار زیاتر دەبێت، بەهۆی ئەو ڕێکارانەی حکومەتی بێئاگای نەتەوەییەکان پەیڕەوی دەکەن، دارییی یەدەگیان لەکاتی هاتنی پەیمانی دانەوەی قەرزەکان کۆتای دێت، بەو شێوەیە بانکەکانی دەوڵەت بەتاڵ دەبن، ئەوە ئێمەین بەرەو کەناری ئیفلاسی داراییمان بردوون.

٢٨- هەڵبەتە ئێوە بە خێرایی تێدەگەن، نموونەی ئەو سیاسەتەی بۆ دۆخی دارایی وایانکرد نەتەوەییەکان پەیڕەوی بکەن، ئەو ڕێکارە داراییە بۆ حکومەتەکەمان گونجاو نابێت.

٢٩- هەموو گریمانەیەك بەڵگەیە لەسەر لاوازبوونی حکومەت و بێهیوابوونی لە تێگەیشتنی مافەکانی خۆی، هاوکات هەموو قەرزێك شمشێری دامۆکلیزە(Damocles) لەسەر سەری ئەو فەرمانڕەواییانە هەڵواسراوە، فەرمانڕەواکان دێنە لای خاوەن بانکەکانی(Bankers) ئێمە، هەروەها کڵاوەکانیان لەدەستی خاوەن بانکەکانی ئێمەیە، لەبری ئەوەی بڕێکی دیاریکراو بە ڕاستەوخۆ بە ڕێگای باجی کاتی وەربگرن، پەنا بۆ قەرزی بانکی دەبەن.

قەرزی دەرەکی وەکو ئەو شتەیە کە بەجەستەی حکومەت هەڵواسرابێت و لە جەستەی نەبێتەوە، تاکو دەکەوێتە ناو خودی جەستە، یان تاکو حکومەت قەرزەکە دەداتەوە، بەڵام حکومەتە نەتەوەییەکان ئارەزوو ناکەن لەو شتەی پێیان هەڵواسراوە دوور بکەونەوە، بەڵکو قەرزەکان دەمێننەوە و ژمارەیان زیاد دەکات، لە دوای ئەوەی قەرزەکان زیادەکەن، لەسەر دەوڵەتەکانیان دەنووسن بە سزادانی خودی خۆتان بە لەدەستدانی خوێن دەمرن.

٣٠- کەواتە قەرزی درەکی چییە؟ تەنها هەڵواسراوێکە بە جەستەی دەوڵەت؟ قەرز بریتییە لە پسوڵەی قەرزی حکومەت، قەرزی دەرەکی وادەکات حکومەت بڕی ڕێژەی سەدی سود لە بڕی کۆی گشتی پارەی

قەرزکراو بدات، ئەگەر سودی قەرز بڕەکەی (٥٠٪) بێت، ئەوە حکومەتی قەرزی وەرگرتووە دوور لە پێویستی خۆی بڕێك پارە کە یەکسانە بە قەرزی گشتی لە ماوەی (٢٠) ساڵ دەیداتەوە بە قەرز دەر، کە بڕکەی یەکسانە بە قەرزی گشتی قەرزکراو بە ڕێژەی (٥٠٪)، دەبێت لە ماوەی (٤٠)ـساڵ دوو بەرانبەری قەرزەکە پارە دەداتەوە، لە ماوەی (٦٠) ساڵ بڕی سێ بەرانبەر قەرزەکە دەداتەوە، بەڵام خودی قەرزەکە وەکو خۆی بە جێگیری دەمێنێتەوە، وەکو ئەوەی قەرزەکە نەدرابێتەوە، چونکە ساڵانە حکومەت تەنها دەتوانێت سودی قەرزەکە بداتەوە، ئەگەر ڕێژەی سەدی سودی قەرزەکە (٥٠٪) بێت.

٣١- بەپێی ئەو داتایانەی سەرەوە دەردەکەوێت، ئەو قەرزانە لەژێر سیستەمی باجی ئێستای ساڵی(١٩٠١)دا، کۆتا سەنت(Cent) یان دیناری هەژاران بە دانی باج تەواو دەبێت، حکومەت باج دەخاتە سەر هەژاران بۆ ئەوەی سودی سەرمایەدارانی بیانی بداتەوە، ئەو کاتەی دەوڵەت پارەی لە سەرمایەدارانی بیانی قەرزکردووە، لەبری ئەوەی بڕی پارەی پێویست لە گەل کۆبکاتەوە، بەبێ پێدانی سود لەسەر شێوەی باج.

٣٢- هەروەها ئەوەندە بەسە بۆ دەوڵەمەندەکان، کاتێك قەرزکردنی حکومەت ناوخۆییە، واتە قەرز لە دەوڵەمەندەکان دەکات، ئەوە پارە لە گیرفانی هەژارەکان دەگوازرێتەوە بۆ گیرفانی دەوڵەمەندەکان، بەڵام کاتێك بەرتیل دەدەین بە خەڵکانێك بۆ ئەوەی قەرزی دەرەکی بگۆڕن بۆ

قەرزی ناوخۆیی، ئەوە هەموو سەروەت و سامانی دەوڵەت دەڕژێتە ناو گەنجینەی ئێمە، بەو شێوەیە هەموو نەتەوەییەکان ئەو برە پارەیەی پێماندەدن کەمتر نییە لە بڕی داواکراوی دەرچوو لە گەنجینەکەمان بۆ قەرز.

٣٣- فەرمانڕەوایانی نەتەوەییەکان بەهۆی گرنگی پێنەدانیان یان بەهۆی گەندەڵی وەزیرەکانیان یان بەهۆی نەزانیان، وایان کردووە وڵاتەکانیان قەرز لە بانکەکانمان بکەن، ئەو فەرمانڕەوایانە بە خودی خۆیان ناتوانن ئەو قەرزانە بدەنەوە. پێویستە درکی ئەو هەقیقەتە بکەن، لەسەر ئێمە پێویست ناکات، ئازار بچێژین بۆ ئەوەی دۆخێکی لەو شێوەیە ئامادەبکەین، تاکو ئەوان قەرزمان لێبکەن، لەبەر ئەوەی خۆیان بە دەستی خۆیان دۆخەکان دەخوڵقێنن و داوای قەرزمان لێدەکەن.

٣٤- حکومەتەکەمان پێشبینی گەورە دەکات بۆ ئەوەی هەڵاوسانی دارایی گەورە روونەدات، لەسەر بنەمای ئەو تێگەیشتنە ئێمە بۆ دەوڵەت پێویستمان بە قەرزی دەرەکی نییە، تەنها یەك قەرز نەبێت، کە سودەکەی (١٪) بێت، هەروەها کۆمپیاڵەکانی ئەو قەرزە لەسەر گەنجینەی دەوڵەت دەبێت، تاکو دانەوەی رێژەی سەدی لەسەر وڵات نەبێت بە شتێکی هەڵواسراو بە جەستەیەوە، تاکو مردن لێی نەبێتەوە.

قەرز دەدەین بە کۆمپانیا بازرگانییەکان تاکو کۆمپیاڵەی جیاواز دەربکەین، ئەو کۆمپانیایانە هیچ ئاستەنگێك لە دانی رێژەی سەدی لە قازانجەکانیان نابیننەوە، چونکە پارە بۆ پرۆژەی بازرگانی قەرزدەکەن،

بەلام حکومەتەکان ناتوانن سودی پارەی قەرزکراو بدەنەوە، چونکە حکومەتەکان بەردەوام قەرزدەکەن بۆ دانەوەی ئەو قەرزانەی پێشتر کردوویانە.

٣٥- هەروەها حکومەت پشکی بازرگانی دەکرێت، بە قەرزەکان خۆی بەرێوەدەبات، لە بری ئەوەی قەرزەکان بداتەوە و خەرجیان دەکات، وەکو ئێستا لە حکومەتی نەتەوەییەکا دەیبینین، ئەو رێکارانە لە کۆتاییدا حکومەت بەرەو خاوبوونەوە و تەمبەلی دەبات، ئەو حالەتانەی حکومەت پێی دەگات، سودی بۆ ئێمە هەیە، تاکو ئەو کاتەی نەتەوەییەکانی نا جوو سەربەخۆن، ئەو حکومەتانە لە حکومەتەکەی ئێمە بچووکتر و لاوازتر دەبن.

٣٦- پێویست بە هێنانەوەی بەلگەی زیاتر ناکات، کە ئەقلیی نەتەوەییەکانی نا جوو بە رەهایی بەتالە، بە هەقیقی رەشەولاغن، کاتێك پارەیان بە سود قەرزکرد، درکی ئەوەیان نەکرد هەموو برێك پارەی قەرزکراو سودی دێتە سەر، هاوکات چاریان ناچارە دەبێت، دەرامەتەکانی ولات دەربهێنن، هەلبەتە بۆیان گونجاوتر بوو ئەگەر پارەیان راستەوخۆ لە گەلی خۆیان وەربگرتبووایە، ئەو کاتە پێویستی نەدەکرد سودی قەرز بە ئێمە بدەن، ئەوە وادەکات پاساو بۆ لێهاتووی خۆمان بهێنینەوە.

له هەقیقەتدا ئێمه گەلێكین خودا هەڵی بژاردووین، ئەوه ژیری و دانایيه ئێمه پرسی قەرزمان به شێوەیەك خسته بەردەم نەتەوەییەكان، به تەواوی باوەڕیانكردووه له پرۆسەی قەرزكردن قازانج دەكەن.

٣٧- بەپێی پێشبینییەكانی ئامادەمان كردووه، كه كاتی گونجاو دێت، پێشبینییەكانمان له ئەزموونی سەدەكانی رابردوو ئامادەدەكەین، ئەو كاتەی نەتەوەییەكان فەرمانڕەواییان دەكردین ئێمه نهێنییەكانی خۆمان دەشاردەوه، پێشبینییەكانی ئێمه له رووی روونی و سەرسامی جیاوازه لەو پێشبینیانەی نەتەوەییەكان كردوویانه، بۆ جیهانی دەبەلگێنین چۆن پلانه نوێیەكەمان سەركەوتووه و بەسوده.

٣٨- بەو پلانه دەستدەگرین بەسەر یەكسانی، له سایەی ئەو پلانه بووین به گەوره و سەروەری نەتەوەییەكان، له فەرمانڕەوایی سەردەمی خۆمان رێگه بەو یەكسانییه نادەین، سیستەمی تەرازوی حكومەتەكەمان به شێوەیەك رێكدەخەین، تاكو پاشاكەمان خودی خۆی لێ نەگۆڕێت، نەبێت به نووسەرێكی بێهۆش، له پێگەیكدابێت تێبینی به هەدەردانی بچووكترین بەشی سامان و دارایی بكات، هەروەها سامان و پاره بۆ هیچ مەبەستێكی دیكه بەكار نەهێنێت، تەنها بۆ مەبەستی ئەو بابەته نەبێت، كه پێشتر له بودجه پێشبینیمان كردووه.

٣٩- نەكردەییه فەرمانڕەواییكردن سەركەوتوو بێت، تەنها به پلانی تۆكمه یاسایی تەواو نەبێت، تەنانەت سوارچاك و پاڵەوانەكانی رووبەڕووی ناخۆشی دەبنەوه، ئەگەر رێگایەك بگرنەبەر نەزانن ئەو رێگایه بەرەو

کوێیان دەبات، یان ئەگەر دەستیانکرد بە گەشتکردن و خۆیان بە تەواوی بۆ گەشتەکە ئامادەنەکردبوو، سەرکەوتوو نابن و بە ئامانج ناگەن.

٤٠- ئێمە یارمەتی پاشای نەتەوەییەکانمان داوە، بۆ ئەوەی دەستبەرداری ئەرکەکانیان لە حکومەتدا بن، لە ڕێگای نوێنەرایەتی کردنی گەل، هەروەها لە ڕێگای رابواردن و خۆشی و شادی بینین، نموونەی ئەو پاشایانە تەنها دەمامکن بۆ شاردنەوەی فێڵ و فریودانەکانمان.

٤١- راپۆرتی نوێنەرکانمان، کە بۆ نمایشکردنی پاشا لە ئەرکە گشتییەکانی ئامادەکراوە، ئەو ئەرکانەی بە دەستی نوێنەرکانمان دروستکراوە، پاشا ئەو راپۆرتانە لە هەموو بۆنەکاندا بەکاردەهێنێت، بۆ ئەوەی وابکات ئەقڵیی پاشا کورت بین بێت، وەکو ئەوەی ئەقڵیی کشابێتەوە، وەکو کورتبینی لە پرۆژەکانی ئابووری داهاتوو، چۆن ئەو پاشایانە دەتوانن بە مەبستی باجی نوێ بگەن؟ خوێنەرانی راپۆرتە نووسراوەکانی ئێمە تەنها دەتوانن ئەوە بپرسن کە ئێمە بە گرنگییەوە نووسیومانە و ئەوان دەیخوێننەوە، بەڵام ئەوان بە کردەوە نەیانپرسی.

٤٢- ئێوە بە خودی خۆتان دەزانن تاکو چ ئاستێك گەندەڵی دارایی گەیشتووە بە فەرامۆشکردنی خودی پاشا، بەهۆی فەرمۆشکردنی حکومەت لەلایەن پاشا، حکومەت ئیفلاسی کردووە، لەگەڵ ئەوەی هاوڵاتییە بەدبەختەکانی هەوڵی بێوچان دەدەن.

# پرۆتۆكۆلی بیست و یەك:

## قەرز و متمانە:

:(Loans and Credit)

١- ئێستا زیاترتان لە كۆبوونەوەی پێشوو پێرادەگەیەنم، بە ڕووون كردنەوەی تەواوی قەرزی ناوخۆیی پارمەتیتان دەدەم، بەڵام چیتر دانووستان لەسەر قەرزی دەرەكی ناكەین، چونكە قەرزی دەرەكی گەنجینەكانی پڕكردین لە دراوی نەتەوەییەكان، لە ڕوویێكی دیكە حكومەتە جیهانییەكەمان هیچ دراوسێیەكی بیانی نابێت، تاكو بتوانێت پارەی لێ قەرز بكات، واتە حكومەتە جیهانییەكەمان پێویستی بە قەرزی دەرەكی نابێت.

٢- گەندەڵی كارگێڕەكان و فەرمۆشی و بێباكی فەرمانڕەوایانی نەتەوەییەكانمان بەكارهێنا، بۆ ئەوەی پارەی دوو بەرانبەر لە بڕی ئەو قەرزانە وەربگرین كە پێشكەشی حكومەتی نەتەوەییەكانمان كردبوو، یان سێ بەرانبەر لە بڕی قەرزەكان وەربگرین، ئەگەرچی لە هەقیقەتدا ئەو حكومەتانە هەرگیز پێویستیان بەو قەرزانە نەبووە، ئەوەی توانی خراپە لەگەڵ ئێمە بكات لە ڕێگای قەرز، ئێمەش ئەوەمان لەگەڵ كردنەوە؟ لەبەر ئەوە تەنها پرسی قەرزی ناوخۆیی وەردەگرم و دانووستانی لەسەر دەكەین.

٣- كاتێك حكومەت قەرزی ناوخۆیی رادەگەیەنێت، تۆمارێك بۆ كۆمپیاڵەی قەرزەكان دەكاتەوە، ئەو قەرزەی حكومەت وەریدەگرێت بڕەكەی كەمە و بەهایەكی زۆر بچووكی هەیە، بۆ ئەوەی هەموو كەسێك بتوانێت پشكی تیادا هەبێت، واتە قەرز بە حكومەت بدات، ئەوانەی یەكەم جار ناوی خۆیان تۆمار كردووە، بۆ ئەوەی قەرز بە شێوەی پشك بە حكومەت بدەن، رێگەیان پێدەدرێت پشكەكان بە كەمتر لە بەهای بنەڕەتی خۆیان بكڕنەوە، لە رۆژی دووەمی فرۆشتنی پشكەكان نرخی كۆمپیاڵەكان بەرزدەكرێتەوە، بۆ ئەوەی هەموو كەسێك واتێبگات هەموو مرۆڤێك سورە لەسەر كڕینی كۆمپیاڵەكان.

بەو شێوەیە لە ماوەی چەند رۆژێكی كەمدا گەنجینەی دارایی دەوڵەت (Exchequer) پڕدەبێتەوە، بەو پارەیەی كە زیادەی لەسەروی سنوری خۆی لە تۆماری كۆمپیاڵەكان نووسراوە، بەردەوام بوون لە پەسندكردنی پارە بۆ قەرزكردن كە لەسەروی ئەو قەرزەی تۆماركراوە، زیادەی دوو ئەوەندەی دەخرێتەسەر؟ بێگومان نووسینی بڕی زیادكراو لەسەر پارەی داواكراو بۆ قەرز زیاتر دەبێت، لەو تۆماركردنە هەموو كاریگەری و نهێنییەكان دەشاردرێنەوە، هاوكات گەل متمانەی دڵنیایی بە حكومەت دەكات.

٤- هەڵبەتە كاتێك كۆمیدیای(Comedy) قەرزكردنی حكومەت كۆتایی دێت، ئەو كاتە دەردەكەوێت ((هەقیقەتی قەرزكردن زۆر گەورەیە))، حكومەت لە پێناوی پێدانی سودی ئەو قەرزانە ناچار دەبێت،

روو بكاتە قەرزكردنی نوێ، قەرزی نوێ ناتوانێت قەرزەكانی دەوڵەت كۆتایی پێبهێنێت، بەڵكو دینارێكی دیكە دەخاتە سەر قەرزەكانی پێشوو، وەلێ كاتێك هێزی حكومەت بۆ قەرزكردنی زیاتر كۆتایی دێت، لەسەر حكومەت پێوست دەكات سوی قەرزەكان بە سەپاندنی باجی نوێ بدات، ئەو باجەی حكومەت دەیسەپێنێت، تەنها قەرزێكە حكومەت كردوویەتی بۆ پڕكردنەوەی قەرزی دیكە.

٥- لەدوای ئەوە ماوەی گواستنەوەی قەرزەكان دێت، بەڵام گواستنەوەی قەرز، تەنها بە كەمكردنەوەی بەهای سودی قەرزەكە دەبێت، لەبەر ئەوە گواستنەوە تەنها بە رەزامەندی خاوەن قەرزەكان دەبێت، كاتێك گواستنەوەی قەرز رادەگەیەنرێت، ماف بە خاوەن قەرزەكان دەدرێت، پەسندی بكەن یان پارەكانیان بۆ بگەڕێننەوە، ئەگەر گواستنەوەیان پەسند نەكرد، واتە ماوەی دانەوە، بە نموونە دەگوازرێتەوە بۆ ساڵێكی دیكە، ئەگەر هەموو كەسێك داوای كرد پارەكەی خۆی بۆ بگەڕێننەوە، ئەوە حكومەت بە سودی ئەو قەرزانە راوكراوە، ئەگەرچی حكومەت ویستبووی بە سودە قەرزەكان گەل راوبكات، هاوكات حكومەت لەو پێگە داراییەدا نییە، بتوانێت پارەی هەموو خەڵك بگێڕێتەوە.

لە چانسی حكومەت، هاوڵاتیانی حكومەتە نەتەوەییەكان زۆر لە پرسی دارایی تێناگەن، هاوڵاتیانی حكومەتە نەتەوەییەكان بەردەوام گرنگی بە دابەزینی بەهای دەستەبەری و كەمبوونەوەی سود دەدەن، بە سەركێشی

کردن لە پرۆسەی دارایی دیکە بۆ وەبەرهێنانی پارەی نویێ، بەو شێوەیە تاکو حکومەتەکانیان دەرفەتییان پێ بدات، قەرزی زیاتر دابنێن، لەوانەیە بڕی قەرزەکانی دەیدەن بە حکومەت بۆ ملیۆنان بەرزبکەنەوە.

٦- ئەمڕۆ قەرز دەرە نەتەوەییەکان ناوێرن ئەوە بکەن، کە ئێمە دەیکەین، بە ڕەهایی دەزانن ئێمە لە حالەتێکی ئاوادا داوای هەموو پارەکانمان بە سودەوە لە حکومەت دەکەینەوە.

٧- کاتێك حکومەت قەرز بەسود لە ڕێگای تۆمارکردن لە کۆمپیاڵە لە هاوڵاتیان وەردەگرێت، دوای ناتوانێت قەرزەکان بداتەوە، ئەوا حکومەت ڕاستەوخۆ دان بە ئیفلاسی بوونی خودی خۆی دادەنێت، هاوکات گەل بە ڕوونی بۆی دەردەکەوێت، بەرژەوەندییە گشتییەکان لەگەڵ بەژەوەندییەکانی حکومەت هاوتەریب بەرێوەناچێت.

٨- دیدگاتان بە تایبەتی ئاراستەی ئەو هەقیقەتە دەکەم، هەروەها دیدگای خۆم ئاراستەی ئەو هەقیقتە دەکەم: هەموو قەرزێکی ناوخۆیی دیاریکراو(consolidated)، پێی دەگووترێت قەرزی کاتی، بۆیە پێی دەڵێن قەرزی کاتی: چونکە بۆ پرسێکی کورتخایەن قەرزدەکرێت، ئەو چۆرە قەرزانە پارەی دانراوای هاوڵاتیانە کە لە بانکی دەوڵەت یان بانکی هەڵگرتن دایدەنێن.

ئەو پارە دانراوانە لەژێر دەستەڵاتی حکومەتە، هەروەها بۆ ماوەیەکی درێژ بەکاردەهێنرێت، لە بەرانبەر پێدانی سودی قەرزە دانراوەکە،

حکومەت لە بری پارە برێکی یەکسان لە بیمەی تایبەت لەو بانکە دادەنێت.

٩- ئەو بیمەیەی دەوڵەت دایدەنێت، هەموو برە کەمبووەکانی گەنجینەی دەوڵەتی نەتەوەییەکانی نا جوو پڕدەکاتەوە.

١٠- کاتێك پاشاکەمان عەرشی هەموو جیهان دەگرێتە دەست، هەموو ئەو پرۆسە فریودەرانە وندەبن، بازاڕی کۆمپیاڵەی قەرزە گشتییەکانی حکومەت لەناودەبەین، چونکە ئێمە رێگانادەین شکۆمان بەپێی سەرکەوتن و دابەزینی پاشەکەوتەکانمان پاشەکشێ بکات، کە یاسا بە بەهای بنەڕەتی بڕیار لەسەر بەهای باشەکەوتەکان دەدات، بەبێ ئەوەی بتوانین نرخەکان بگۆڕین، سەرکەوتن دەبێتە هۆکاری دابەزین، ئێمە بە سەرکەوتن دەستمانپێکرد بۆ ئەوە متمانە بە کۆمپیاڵەی قەرزە گشتییەکانی حکومەتە نەتەوەییەکان نەهێڵین.

١١- بازارەکانی کۆمپیاڵەی قەرزی گشتی حکومەتە نەتەوەییەکان دەگۆڕینەوە بە پاشەکەوتی چەکی دارایی (Exchanges Stock)، ئەرکی رێکخراوە حکومییە مەزنەکانە بەو شێوەیەی حکومەت بە گونجاوی دەبینێت، باج بەسەر پرۆژەی بازرگانییەکاندا بسەپێنن. ئەو رێکخراوانە لە پێگەیەکدان دەتوانن لە بازاڕدا بەهای مەلاین لە پشکە بازرگانییەکان دیاری بکەن، یان لە هەمان رۆژدا رێکخراوە حکومییەکان دەتوانن ئەو پشکانە بکڕنەوە، بەو شێوەیە هەموو پرۆژە

بازرگانییەکانی پشتیان پێدەبەستن، ئێوە دەتوانن وێنای چ هێزێك بکەن دەتوانێت لەوکاتەدا بەو شێوەیە کارەکان جێبەجێ بکات.

# پرۆتۆکۆلی بیست و دوو:

## هێزی ئاڵتوون:

:(Power of Gold)

١- لە هەموو ئەو پرسانەی تاکو ئێستا پێم ڕاگەیاندوون، هەوڵمداوە وێنەیەکی ڕاست و دروستی نهێنی ڕووداوەکانی ئێستا و داهاتووتان پێبدەم، ((ئەو نهێنیانەی لە ڕووباری قەدەر سەرچاوەدەگرن))، وەلێ ئەنجامی نهێنی ڕووداوەکان لە داهاتوویەکی نزیکدا دەردەکەون، ئەو پلانە نهێنییەم بۆ خستنەڕوو، کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەتەوەییەکان پێدەکەین، هەروەها سیاسەتی دارایی خۆمانم بۆ خستنەڕوو، تەنها بۆم هەیە، چەند وشەیەکی کەم زیاد بکەم.

٢- لەمڕۆدا مەزنترین هێز لە دەستمان کۆبووەتەوە، مەبەستم لە هێزە ئاڵتوونە، کە لەماوەی دوو ڕۆژدا دەتوانین هەر بڕێکی دەمانەوێت لە ئاڵتوونی گەنجینە نهێنییەکەمان ڕابکێشین.

٣- ئایە دوای ئەو هەموو سەرکەوتنانە پێویستە لەسەرمان، پاساو بهێنینەوە کە فەرمانڕەوایی ئێمە ویستی خودایە؟ ئایە دەکرێت ... دوای ئەوەی ئەو هەموو سەروەت و سامانەی بووە بە موڵکی ئێمە، نەتوانین ئەو بسەلمێنین، ئەو هەموو ئاڵتوونەی لە ماوەی سەردەمانی زوو بەدەستمان هێناوە و پاشەکەوتمان کردووە، یارمەتیمان بدات لە

مەبەستە راستەکەمان بۆ کاری چاکە، یان بۆ ئەوەی دووبارە سیستەمی فەرمانڕەوایی رابردوومان بگەڕێنینەوە ژێر دەستەڵاتی خۆمان؟

دووبارە گێڕانەوەی سیستەمی فەرمانڕەوایی بڕێکی دیاریکراو لە توندوو تیژی گەرەکە، بەلأم ئەو سیستەمە لە کۆتاییدا سەقامگیر دەبێت، دەیبەلگێنم ئێمە چاکترینین کە ئاشتی و ئازادی ونبوو بۆ جیهانی پەست و بێزار دەگەڕێنینەوە، بەلأم ئەمە بە دڵنیایی تەنها لە یەك حالەت دەبێت، ئەو کاتەی جیهان بە توندی دەستدەگرن بە یاساکانمان، لە سەروی ئەوانە بە روونی و کراوەیی ئازادی بۆ هەموو مرۆڤێك دەگێڕینەوە، ئەو ئازادییەی لەسەر لەناوچوون و فەسادی یان لەسەر مافی کارکردنی خەڵك بونیادنەنراوە، پێگەی مرۆڤ و هێزی مافەکانی رێگەی پێنادەن پرەنسیپی تێکدەرانە بلأویکاتەوە، وەکو پرنسیپەکانی "ئازادی بڕوای ئایینی و یەکسانی" و ئایدیا هاوشێوەکانی دیکە، هەروەها بە روونی و کراوەیی ئەو راستییە دووبارە دەگەڕێنینەوە و دەیچەسپێنین، ئازادی تاك واتای ئەوە نییە هەموو پیاوێك مافی دەوڵەمەندبوونی هەیە، یان کەس مافی ئەوەیان نییە، بە گاڵتە و پێکەنین باس لە مافی خەڵك بکات، خەڵك تووشی نائومێدی و بێهیوایی بکات.

وەلێ جیهان فێردەکەین ئازادی راست و دروست، لە دەستدرێژی کردن بۆ سەر کەسایەتی مرۆڤ و موڵك بونیادنانرێت، لە کاتێکدا ئەو مرۆڤە راستگۆیانە پابەندن بە هەموو یاساکانی ژیانی کۆمەلأیەتی، هەروەها

جیهان فێردەکەین، پێگەی مرۆڤ لەسەر وێناکردنی مافی مرۆڤەکانی دیکە بەندە، هاوکات شەرفمەندی خود لە ئایدیای بێبنەما و هیچ دووری دەخاتەوە.

٤- دەستەڵاتەکەمان جووامێر و سەروەر دەبێت، لەبەر ئەوەی بەتوانایە و فەرمانڕوایی دەکات و ڕێنماکارە، بەڵام لە ڕێگای پیادەکردنی هێزی گەل و نوێنەرەکانی ناگات بەو تایبەتمەندیانە، یان لە ڕێگەی هیچ گروپێك لەو وتاربێژانەی بە وشەی ئاسایی بانگشەدەکەن و پێی دەڵێن پرنسیپی باڵا، ئەو وشانە لە هەقیقەتدا شێك نین، تەنها ئایدیای یۆتۆپیا و ئەندێشە نەبێت، بەڵکو دەستەڵاتەکەمان دەزگایە بۆ سیستەمێك، کە بەختەوەری خەڵك فەراهەم دەکات، شکۆی ئەو دەستەڵاتە خۆشەویستی سۆفیانە بەرجەستە دەکات، هەروەها ملکەچبوونی کۆی نەتەوەکان بەرجەستەدەکات، دەستەڵاتی هەق تەسلیمی هیچ نا هەقیەك نابێت، تەنانەت تەسلیمی هەقی (خودا) ش نابێت، بەو شێوەیە یەك کەس ناوێرێت لێی نزیك بێتەوە، هاوکات کەس ناتوانێت دەستەڵاتەکەی بۆ خۆی بەرێت، ئەگەر ئەو کەسە بەشێکیش بێت لە تواناکانی.

# پرۆتۆکۆلی بیست و سێ:

## نەریتی ملکەچپێکردن:

## :(<u>Instilling Obedience</u>)

١- پێویستە خەڵك لەسەر بێفێزی و شەرمکردن رابهێنین، بۆ ئەوەی ژێردەستە و ملکەچمان بن، بۆ ئەم مەبەستە کەرەسەکانی کات بەسەربردن کەم دەکەینەوە، بەو رێکار و ئامرازانە ئەو ئەخلاقە دەسەپێنین، کە کێبڕکێی بەردوام لەسەر بوارەکانی شکۆمەندی خراپی کردبوو، هەروەها پیشەسازی جووتیاری یان لادێنشینی (Peasantindustries) پەیرەو دەکەین، تاکو کارگەی تایبەت لەناوببەین.

پێویستییەکانی لە پێناوی ئەو چاکسازیانەی ئەنجامی دەدەین، لە هقیقەتدا بە دژایەتی کردنی خاوەن کارگە مەزنەکان تەواو دەبێت، لەبەر ئەوەی زۆربەی کرێکارەکانیان دژی حکومەت دەوەستێننەوە، لەوانەیە کرێکارەکانیان بێ ئاگایەنە دژی حکومەت بوەستنەوە.

کاتێك کرێکار یان گەل لە کارگە لۆکالییەکان کاردەکەن، هیچ حالەتێك لە دەرەوەی "کارکردن" یان "بێکاری" تێناگەن، ئەو حالەتە وادەکات گەل دەست بە سیستەمی فەرمانڕەوایی بگرن و لە دژی نەوەستنەوە، گەل بە یارمەتیدانی حکومەت فریودەدەین، ((بێکاری گەورەترین مەترسیە

لەسەر حکومەت))، هاوکات بێکاربوونی گەلان کاری خۆی کرد، کە ئەنجامەکەی ئێمەی بە رێگای گەیشتنە دەستەڵات گەیاند.

بەردوامی شەراب و مەی نۆشین، وەکو تاوانێکی دژی مرۆڤایەتی یاساغ دەکەین، شەراب و مەی خۆرەکان لەو رووە سزادەدەین: (پیاو و ئاژەڵان لە ژێر کاریگەری شەراب یان جۆرەکانی مەی هاوتای یەکدین).

٢- بەڵام گەلان کوێرانە ملکەچ نابن، تەنها بۆ دەستەڵاتێکی بە توانا و بە رەهایی سەربەخۆ لە گەل نەبێت، واتە دەبێت دەستەڵات خاوەنی هێزێکی تایبەت بە خودی خۆی بێت، ئەو هێزە سۆز و خۆشەویستی بۆ گەل نەبێت، واتە هێزی گەل نەبێت، هاوکات دەستەڵات دەبێت پیشانی گەل بدات، شمشێرێکی لە کەلان هەڵکێشراوی لە دەستدایە(مەبەستمان هێزە خودییەکەی دەستەڵاتە)، وەکو چەکی بەرگری لە دژی شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکان بەکاریدەهێنێت، بەڵام نەتەوەییەکانی نا جوو، لەبەر چی دوای هەموو ئەو کوێرەوەری و نەفرەتانەی بەسەریان هات، دەیانەوێت پاشاکەیان لە رۆحی فریشتە بێت؟ بەڵام گەل بە پێویستی دەزانێت، لە خودی پاشا "هێز و توانا" بەدی بکات، بۆ ئەوەی توانای پارێگریکردنیانی هەبێت.

٣- پێویستە ئەو پاشایەی حکومەتی نەتەوەییەکانی هەڵوەشاندەوە دەربکەوێت، ئەو حکومەتانەی لەسەر خوێنی خەڵك دەژیان، ئێمە بە خودی خۆمان توانیمان ئەخلاقیان لە رێگای گڕی ئاژاوە خراپ بکەین،

پێویستە ئەو پاشایە دەربکەوێت، گڕی ئەو ئاژاوەیەی کڵپەکانی بەدوای یەکدا بۆ هەموو لایەك هەڵدەچێت، بکوژێنێتەوە.

بۆ ئەوەی پاشا بگات بەو ئەنجامە، پێویستە هەموو ئەو دەستە و گروپانە لەناوببات، کە سەرچاوەی ڕەسەنی گڕی ئەو ئاگرە کلپەدارەن، ئەگەر پاشا تاکو خوێنی خودی خۆی ڕشت، دەستی گرت بەسەر ئاژاوەکە، ئەوە پێویستە سوپایەکی چاکی ڕێکخراوی هەبێت، بە ویست و پێداگری شەڕی ئەو پەتایە یان ئاژاوەیە بکات، کە جەستەی حکومەتی ژەهراوی کردووە.

٤- پاشاکەمان دەبێت لەلایەن خودا هەڵبژێردرابێت، لە بەرزی دانرابێت، بۆ ئەوی هەموو ئەو ئایدیایانە لەناو بەرێت، کە غەریزەکان فریودەدەن نەك ئەقڵ، هەروەها پرنسیپی ئاژەڵی فریودەدەن نەك پرنسیپی مرۆڤانە، ئەو پرنسیپە غەریزی و ئاژەڵیانە لەناو خەڵك بە گشتی و پاشاکاندا بە تایبەتی بڵاودەبنەوە، بڵاوبوونەوەی غەریزە و حەزی ئاژەڵی لە کاری دزی و ستەمکردن بە پاساوی ماف و ئازادی دەستەڵاتداران سەرکەوتوو دەکات.

ئەو ئایدیایانە هەموو سیستەمێکی کۆمەڵایەتی لەناوبرد، وەلێ بەو ئایدیایانەی نەتەوەییەکانمان پێ فریودابوو، پاشاکەمان - پاشای جووەکان یان ئیسرائیل (Kingdom of Israel) گەیشتە دەستەڵات، بەڵام کاری ئەو ئایدیایانە کۆتایی دێت، کاتێك فەرمانڕەوایی پاشاکەمان دەستپێدەکات، ئەو کاتە پێویستە لەسەرمان ئەو ئایدیایانە

بۆ دوور رابماڵین، تاکو هیچ نەفرەت و خراپەیەك لە ڕێگای پاشاکەمان نەمێنێت.

٥- ئەوکاتە ئێمە دەتوانین لە ناو گەل هاوار بکەین بڵێین: ((ستایشی خودا بکەن))، لەبەردەمی ئەم پاشایە کڕنۆش بەرن، کە هەڵگری ئایەتی پێشبینیکراوی ئەزەلییە بۆ جیهان، خودا بە خودی خۆی وەکو ئەستێرە ڕێبەری دەکات، یەك کەسی دیکە نییە، تەنها پاشا بە خودی خۆی(Himself) دەتوانێت وابکات ((مرۆڤایەتی لە هەموو تاوانێك ئازاد بکات))[1].

---

[1]- جوولەکان چاوەڕوانی مەسیحی ڕزگارکەرن، دوای ئەوەی بوون بە کۆیلە – لە کۆیلایەتی ڕزگاریان بکات، موڵکی جیهانیان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام کاتێك مەسیح بە وێنەی پەیامبەری پیرۆز دەرکەوت، هەوڵیدا ڕۆحی و ئەخلاقی لە تاوانەکانیان ڕزگاریان بکات، بە وێنەی پاش دەرنەکەوت، تاکو دەستەڵاتی جیهانیان بۆ بگێڕێتەوە، لەبەر ئەوە ڕقیان لێی بووەوە و دژایەتیان کرد، جوولەکان تاکو ئەمڕۆ چاوەڕوانی هاتنی مەسیحی ڕزگارکەرن، بە وێنەی پاشا لە ڕەچەڵکی داود، تاکو ڕزگاریان بکات لە دوور خراوەیی و بێزاری، ئەو ڕزگارکەرەی لە ڕەچەڵەکی داودە و چاوەڕوانی دەکەن، وەکو جوولەکان خۆیان لەم پرۆتۆکۆلانە دەڵێن و کتێبی پیرۆزی تەورات لە (سفری ئەشیعا و بەشەکانی دواتر) دەڵێت: ئەو ڕزگارکەرە مرۆڤایەتی لە تاوان ڕزگار دەکات، لە دیدی جوولەکان ئەو ڕزگارکەرەی چاوەڕوانین دەوڵەتی جوویان بۆ دەگێڕێتەوە و هەموو نەتەوەییەکانی دیکەیان دەخاتە ژێر دەست، هاوکات دەبێت بە پاشای ئەوان و پاشای هەموو جیهان.

## پرۆتۆكۆلی بیست و چوار:

## فەرمانڕەواییكردنی جۆریی:

## :(Qualities of the Ruler)

١- ئێستا چارەسەری ئەو شێوازە دەكەم، كە دەوڵەتی(Dynasty) پاشا داود(David) بەهێز دەكات، بۆ ئەوەی تاكو ڕۆژی كۆتایی بەردەوام بێت.

٢- شێوازی ئێمە بۆ چاككردنەوەی دەوڵەت، خودی ئەو پرنسیپانە لەخۆدەگرێت، كە فەرمانڕەوایانمان پێگەكانی جیهانیان پێی وەرگرتەوە یان هەموو ڕەگەزی مرۆڤیان پێی ئاراستەكردوو و فێركرد.

٣- زۆرێك لە ئەندامانی نەژادی داود پاشا و خەلیفە ئامادە دەكەن و پەروەردە دەكەن، بەڵام ئەو پاشا و خەلیفانە بە مافی میراتگری هەڵنەبژێردراون، بەڵكو بە كارامەیی تایبەتی خۆیان هەڵبژێردراون، ئەو خەلیفانە لە پاشخانە سیاسیە نهێنییەكانی ئێمە زانیاری وەردەگرن و لە پلانی فەرمانڕوایی تێدەگەن، بەڵام ئێمە زۆر بەئاگادەبین، تاكو هیچ مرۆڤێكی دیكە بە سیاسەتە نهێنییەكانمان نەزانێت. جێبەجێكردنی ئەو ڕێكارانە پێویستە، بۆ ئەوەی هەمووان بزانن، ئەوانەی دەتوانن فەرمانڕەوایی بكەن، تەنها ئەوانەن لە نهێنییەكانی هونەری سیاسەت تێگەیشتوون و دەزانن.

٤- هەروەها تەنها ئەو پیاوانە دەزانن چۆن پلانەكەمان بە پراكتیكی جێبەجێ بكەن، چونكە ئەوانە ئەزموونی ماوەی سەدە زۆرەكانی ئێمەیان بەكارهێناوە، ئەو خەلیفانە لە ئەنجامی پوختەكراوی تێبینی كراو لە

سیستەمە سیاسی و ئابوورییەکانمان تێدەگەن، هەروەها لە هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکانمان تێدەگەن، ئەو خەلیفانە بە مجازی رۆحی هەقیقی ئەو یاسایانە تێدەگەن، کە سروشت بە خودی خۆی بۆ فەرمانڕەواییکردنی جۆری مرۆڤ دایناون.

٥- ئێمە راستەوخۆ لە شوێنی خەڵیفەکانیان پاشای دیکە دادەنێین، ئەگەر ئاماژەکان واکەوتەوە خەلیفەکانیان شەیدا و ئاڵودەی ئارەزووی سێکسی بوون، یان لەماوەی پەروەردەکردنیاندا تواناییان لاوازبوو، یان لە حالەتی دەرکەوتنی هەر ئارەزوویەکی دیکە، زیان بە دەستەڵاتیان بگەیەنێت، لەوانە ئەو ئارەزووە وابکات نەتوانن فەرمانڕەوایی بکەن، ئەگەر لەو ئارەزووەی هەیانە شکۆ و سەروەری تاجی فەرمانڕوایی بخاتە مەترسییەوە.

٦- پیرانمان(Our elders) هیوای چوون بۆ قەیرانی دەستەڵات ناخوازن، تەنها ئەو بیرمەند و پیاوانەمان نەبێت، کە دەتوانن فەرمانڕواییەکی یەکلاکەرەوە بۆ نەهێشتنی قەیرانەکانی دەستەڵات پەیڕەو بکەن، ئەگەر بە توندوتیژیش بێت.

٧- ئەگەر پاشاکەمان نەخۆش کەوت یان لەبەر هەر هۆکارێك توانای فەرمانڕواییکردنی نەما، رەتیدەکاتەوە قەیرانی فەرمانڕەواییکردن رادەستی یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی خۆی بکات، کە بەخودی خۆی سەلماندبێتی توانای فەرمانڕەوایی کردنی هەیە.

٨- پلانەکانی پاشا خێرایە، هاوکات پلانەکانی پاشا بۆ داهاتووە، بەڵام پلانەکانی پاشا ناسراو یان زانراو نییە، تەنانەت لەلای راوێژکارە

نزیکەکانیشی ناسراو یان زانراو نییە، هیچ کەس پلانی داهاتووی پاشا نازانێت، تەنها خودی پاشا و ئەو (۳) کەسەی پاشایان رایانهێناوە.

۹- خەڵك دەبینن پاشا بە ویست و دوور لە ئاژاوە فەرمانڕەوایی دەکات، پاشا خودی خۆی مرۆڤانە رێکخستووە، بۆ نموونە ئەوەی بۆ خودی خۆی بە رەوای دادەنێت، بۆ هەموو مرۆڤایەتی بە رەوای دادەنێت.

۱۰- بەڵام کاتێك پاشا فرمان دەردەکات، یەك کەس ئامانجەکەی نازانێت، لەبەر ئەوە یەك کەس ناوێرێت رێگری لە رێباز و رێگا نهێنییەکانی بکات. پێویستە پاشا ئەقڵێکی ئاوای هەبێت، بتوانێت کۆی پلانەکەمان جێبەجێ بکات، لەبەر ئەوە فەرمانڕواکانمان ناچنە سەر عەرشی دەستەڵات، پێش ئەوەی هێزی ئەقڵیی خۆی بەسەلمێنێت.

۱۱- بۆ ئەوەی پاشا لەلای هەموو هاوڵاتییەك خۆشەویست و بەرێز بێت، پێویستە زۆر جار قسەیان لەگەڵ بکات، نموونەی ئەو رێکارانە وادەکات دوو هێز ئاوێزانی یەکدی بن: مەبەستم هێزی گەل و هێزی پاشایە، ئەگەر چی لە وڵاتانی نەتەوەییەکانی نا جوو بە خودی خۆمان ئەو دوو هێزەمان لێکدی جیاکردەوە، بە مانەوەی ئێمە ئەم دوو هێزە لە وڵاتی نەتەوەییەکانی نا جوو بەردوام ترسیان لە یەکدی دەبێت.

۱۲- پێویستە لەسەرمان ئەو دوو هێزە لە ترسی بەردەوام لە یەکدی بهێڵینەوە، چونکە کاتێك ئەو دوو هێزە لە یەکدی جیابوونەوە، هەردووکیان کەوتنە ژێر هەژموونی ئێمە.

۱۳- لەسەر پاشای ئیسرائیل پێویستە نەکەوێتە ژێر جڵەوی ئارەزووە تایبەتییەکانی، بە تایبەتی ئارەزووی سێکسی، پێویستە لەسەر پاشا

ڕێگە بە غەریزە ئاژەڵییەکانی خودی خۆی نەدات، بە شێوەیەك ئەقڵیی داگیر بکات، چونکە ئارەزووی سێکسی لە هەموو ئارەزووەکانی دیکە بەهێزترە، بێگومان هەموو هێزی بیرکردنەوە و پێشبینی کردنی کارەساتەکان لەناودەبات، ئارەزووی سێکسی ئەقڵیی پیاوان بەرەو خراپترین لای سروشتی مرۆڤانە ئاراستە دەکات.

١٤- لوتکەی مرۆڤایەتی لە کەسایەتی فەرمانڕەوای هەموو جیهاندایە (World ruler)، فەرمانڕەوای هەموو جیهان لە تۆی (seed) داودە، پێویستە پاشاکەمان، کە فەرمانڕەوای جیهانە، هەموو ئارەزووە خودییەکانی خۆی لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی گەل تورهەڵبدەدات.

١٥- پێویستە پاشاکەمان نموونەی ((خۆشەویستی و جووامێری و مەزنی (Erreprochable) بێت)).

١٦- نوێنەرانی سەهیۆنی لەناو پلەبەندی چینی بیرمەندا و فەرمانڕەوایانی سەهیۆنیدا پلەی (سی و سێ)یان هەیە [1].

---

[1] - شایەستەترین ماسۆنییەکانییە جووەکان نوێنەرەکانن: ئەوانەی لەم پرۆتۆکۆلانەدا بە نوێنەری جووەکان ناویان هاتووە گەورەترین و مەزنترین ماسۆنییەکانن لە جیهاندا.

# سەرچاوەكان

تێبینی:

لەكاتی وەرگێڕانی ئەم كتێبە بۆ سەر زمانی كوردی، سودم لە كتێبی (پرۆتۆكۆلی بیرمەند و فەرمانڕەوایانی سەهیۆنی) چەند وەگێڕێكی ناسراوی عەرەب بینیوە، بۆ ئەوەی بتوانم دەقی پرۆتۆكۆلەكان وەكو خۆیان بە كوردی پێشكەشی ئێوەی خوێنەری بكەم.

سەرچاوە سەركییەكان:

١- محمد خليفة التونسي(١٩٦١): بروتوكولات حكماء صهيون، ط٤، دار الكتاب العربي، بيروت – لبنان.

٢- عباس محمود العقاد(١٩٨٠): بروتوكولات حكماء صهيون، ط٥، ميسر.

٣- عجاج نويهض (١٩٥٨): بروتوكولات حكماء صهيون، المؤسسة العربية للدراسات والنشر عمان – اردن.